غه‌فوور مه‌خمووری

# به‌عه‌ره‌بکردنی کوردستان ١



به‌عه‌ره‌بکردن

مه‌ترسییه‌کانی - به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی

چاپی دووه‌م

له بلاوکراوه‌کانی لیژنه‌ی بالای به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی به‌عه‌ره‌بکردنی کوردستان

2006 - هه‌ولێر

# بەعەرەبکردنی کوردستان ١

## بەعەرەبکردن - مەترسییەکانی - بەرەنگاربوونەوەی

**غەفوور مەخمووری**

**چاپی دووەم**

**هەولێر - باشووری کوردستان - ٢٧٠٦ی کوردی - ٢٠٠٦ی زایینی**

- کتێب: بەعەرەبکردنی کوردستان
- نووسینی: غەفوور مەخمووری
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٢ لە بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی میدیا
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٦
- چاپخانە: چاپخانەی منارە
- بڵاوکردنـــەوە: لـــەبڵاوکراوەکانی لیژنـــەی بـــاڵای بەرەنگاربوونـــەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان
- شوێنی چاپکردن: هەولێر– باشووری کوردستان
- خۆشنووسیی بەرگ: محەممەد زادە
- پیت چنین و نەخشەسازی: کۆمپیوتەری دەریا
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمـــارەی ســـپاردن: ژمـــارە (٢٠٠)ی ســـاڵی (٢٠٠٦) لەکتێبخانـــەی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆشنبیری و هونەر.

# پێشکەش

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:

- گیانی پاکی براو هەڤاڵی خۆشەویستم شەهید (سەربەست مەحموود)ی جوانەمەرگ.

- قەهاری برام.

- زیلانی کچم.

- دایکی زیلان.

غەفوور مەخمووری

# پێشەکی چاپی دووەم

لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٢دا؛ کە کتێبی (بەعەرەبکردنی کوردستان)مان چاپو بڵاوکردەوە، لەماوەیەکی کەمدا لەبازاڕو کتێبخانەکانی کوردستاندا نەمایەوەو پێشوازییەکی گەرمی لێکرا، لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە تاکە لێکۆڵینەوەی زانستییە کە بەشێوەیەکی گشتگیر لەسەر بەعەرەبکردنی کوردستان نووسرابێت، بۆیە خوێنەریش بەردەوام بەدوایدا دەگەڕێت, زۆر جار لەلایەن دۆستو هەڤاڵانو خوێنەران داوام لێکراوە کە کتێبەکە چاپ بکەمەوە، منیش لەم دواییەدا وەك بەدەنگەوە چوونی خوێنەران بڕیاری چاپکردنەوەی کتێبەکەمداو، (لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان)یش بە سوپاسەوە ئەرکی چاپکردنەوەکەی گرتە ئەستۆ.

چاپکردنەوەی ئەم کتێبە لەم قۆناغەدا گرنگی خۆی هەیە، بۆ ئەوەی نەوەی ئێستاو دوارۆژ تاڵیو ناخۆشییەکانی ڕۆژانی ڕابردوویان لەبەرچاو بێتو پەندی لێوەربگرن، ئەمە لەلایەك؛ لەلایەکی تر ڕاستە ئێستا ڕژێمی بەعسی عێراق ڕووخاوەو لەسەر کار نەماوە بەڵام تائێستاش سیاسەتی بەعەرەبکردن بەشێوازی جیاجیا درێژەی هەیەو دەسەڵاتدارانی ئێستای عێراق لەهەوڵی جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتەدان، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە عەقلییەتی عەرەبی نەگۆڕاوەو هەمان عەقلییەتی بەرێیەو، بۆی بلوێت لەدەسەڵاتی پێشوو

خراپتر دەکات، ئەوا هەموو لایەکمان دەبینین کە هەڵویستی دەسەڵاتی عەرەبی لەسەر پرسی کەرکوك‌و مەخموورو خانەقین‌و شنگاڵ چییە؟ ماددەی ٥٨ لە TAL کە تایبەتە بە ئاساییکردنەوەی ناوچە عەرەبکراوەکانی کوردستان تائێستا جێبەجێنەکراوەو دیاریش نییە کە جێبەجێی دەکرێ یان نا؟! لەم روانگەیەوە چاپکردنەوەی ئەم کتێبە سوودی خۆی دەبێت بۆ ناساندنی زیاتری سیاسەتی بەعەرەبکردن‌و مەترسییەکانی‌و خۆ ئامادەکردنی گەلی کوردستان بۆ چۆنییەتی بەرەنگاربوونەوەی ئەو سیاسەتەگڵاوە، لەبەر ئەوەی لە فەسڵی سێیەمی کتێبەکەدا ڕێگاکانی بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستانمان خستۆتەڕوو.

هیوادارین چاپی دووەمیش وەك چاپی یەکەم جێی رەزامەندیتان بێت‌و، ئێوەی بەڕێزیش بە سەرنج‌و پێشنیارو رەخنە کتێبەکە دەوڵەمەندتر بکەن‌و، ناتەواوییەکانی تەواو بکەن، لەبەر ئەوەی هیچ کارێك بێ کەم‌و کورتی‌و ناتەواوی نابێت.

**غەفوور مەخمووری**

**٢٠٠٦/٤/١٤**

**هەولێر- باشووری کوردستان**

# پێشەکی چاپی یەکەم

بەعەرەبکردنی کوردستان تاوانێکی گەورەیە دژی نەتەوەی کورد کە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان ئەنجامدەدرێت و بۆتە هەڕەشەیەکی گەورە لەسەر ئێستاو دوارۆژی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان و، تائێستا زۆر کەم لەبارەیەوە نووسراوە، کە دەبووا زۆری لەسەر بنووسرێت و لە هەموو ڕوویەکەوە لێیبکۆڵرێتەوە.

لەدوای ئەوەی لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی کوردستان دابەشی سەر چوار دەوڵەتی داتاشراو (عێراق، ئێران، تورکیا، سوریا) کراو، باشووری کوردستان بەعێراقی عەرەبی و ڕۆژئاوای کوردستانیش بەسوریای عەرەبییەوە لکێنران، هەریەك لەعێراق و سوریا کەوتنە بەعەرەبکردنی کوردستان و لەم پێناوەشدا هەموو شێوازێکی دژ بەمرۆڤانەیان پیادەکردو دەستیان لەهێرش و تالان و قڕکردنی کورد نەپاراست و ئەوەی لەدەستیان هات لەدژی کورددا کردیان و، ئێستاش لەسەر ئەو سیاسەتەیان بەردەوامن و درێژەی پێدەدەن.

لەهەمان کاتدا لەباکووری کوردستاندا ڕژێمی داگیرکەری تورکیا کەوتۆتە بەتورککردنی کوردو، لەرۆژهەلاتی کوردستانیشدا ڕژێمی داگیرکەری ئێران

کەوتۆتە بەفارسکردنی کورد، بەم شێوەیە داگیرکەرانی کوردستان لە هەر چوار لاوە هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەکەمان دەدەن.

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، تائێستا زۆر کەم لەسەر ئەم تاوانەی داگیرکەرانی کوردستان نووسراوەو، بایەخێکی تەواوی پێنەدراوە، کە دەبوا پرسێکی وا چارەنووسساز تائێستا چەندین لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی لەبارەوە بکرابووایە، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین جگە لەچەند نووسین و وتارو نامیلکەیەك شتێکی تر شك نابەین، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە گەورەیی مەترسیو هەڕەشەکانی ئەو پیلانەو درندەیی داگیرکەرانی کوردستان وایان کرد، کە ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر تاوان و پیلانی راگواستن و بەعەرەبکردنی کوردستان بەئەنجام بگەیەنم. لێکۆڵینەوەکەم دابەشی سەر سێ فەسڵ کردووە:

فەسڵی یەکەم؛ لە چوار بەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا باسم لەهاتنی عەرەب بۆ کوردستان کردووەو، لەفتوحاتی ئیسلامی لە ١٦ی کۆچی بەرامبەر ٦٣٧ی زایینیەوە دەستم پێکردووە، لەبەر ئەوەی پێش ئەو مێژووە عەرەب لەکوردستاندا بوونی نەبووەو، لەگەڵ هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە وردە وردە عەرەب هاتۆتە ناوچەکە. دواتر لە فەسڵەکانی تری ئەم کتێبە باسم لەکاریگەری هاتنی عەرەب بۆ کوردستان بۆ سەر بەعەرەبکردنی کوردستان کردووە، بەباوەڕی من لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەری ئیسلام محەممەد(د.خ)، دەسەڵاتی ئیسلام لە زۆربەی سەردەمەکانی دەسەلاتدارێتی لەپراکتیکدا سروشتێکی مرۆیی وەرگرتووەو هەڵەی مرۆیشی تێکەوتووە، ئەگەر سەیر بکەین قۆناغی دوای پێغەمبەر(د.خ) لەئیسلامدا قۆناغێکی جیا لەقۆناغی پێشووی خۆیەتی، لەقۆناغی دواییدا زیاتر کار بۆ پاوان کردنی دەسەڵات و فراوانکردنی سنووری دەسەڵات کراوەو هەر لەم پێناوەشدا لەچوار خەلیفە سێیانیان تیرۆر کراون (عەلی کوڕی ئەبو تالب، عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کوڕی عەفان)، تەنها (ئەبوبەکری سددیق) تیرۆر نەکراوەو کۆچی دوایی کردووە. قۆناغی فتوحاتی ئیسلامیش لەدوای کۆچی دوایی

پێغەمبەر(د.خ) دەستی پێکردووە. لەبەشی دووەمدا باسم لەقۆناغەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان کردووەو لەدروستکردنی دەوڵەتی عێراقەوە دەستم پێکردووەو دابەشی سەر چوار قۆناغم کردووە (سەردەمی پاشایەتی، سەردەمی کۆماری، سەردەمی بەعس، دوای راپەڕین)و شێوازەکانی بەعەرەبکردنی هەریەك لەو قۆناغانەم خستۆتە ڕوو و باسم کردوون. لەبەشی سێیەمدا باسم لە بەعەرەبکردنی رۆژئاوای کوردستان (کوردستانی بندەستی سوریا) کردووەو شێوازەکانی بەعەرەبکردنی ئەو بەشەی کوردستانیشم خستۆتە ڕوو و باسم کردوون. لەبەشی چوارەمیشدا باسم لە بەعەرەبکردنی کوردەکانی لوبنان کردووە.

لە فەسڵی دووەمدا؛ مەترسییەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان لەسەر بوونی کوردو تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی (خاك، زمان، مێژوو-داب و نەریت، هەستی هاوبەش) خراوەتە ڕوو و بەجیا باسی هەر یەکێکیانم کردووە.

لەفەسڵی سێیەمیشدا؛ باسم لەشێوازەکانی بەرەنگار بوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان کردووەو چەند شێوازێکم بۆ ئەم مەبەستە خستۆتە ڕوو. لەکۆتایی هەر سێ فەسڵیشدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەم لە (١٤) خاڵدا چڕ کردۆتەوە.

هەروەها لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا سێ پاشکۆ خراونەتە ڕوو، یەکێکیان تایبەتە بە کۆمەڵێ بەڵگەنامە کە گوزارشت لە راگواستن و قڕکردنی کوردو تالانکردنی سامانی کوردستان و هێنانی عەرەب بۆ کوردستان و نیشتەجێکردن (استیطان) یان لەکوردستان دەکات و، پاشکۆی دووەمیش تایبەتە بە چەند نەخشەیەك، پاشکۆکەی تریش تایبەتە بە کۆمەڵی وێنەی فۆتۆگرافی کە بریتییە لە خستنەڕووی چەند شارو ناوچەیەکی کوردستان و هەندێ گوندی رووخاوی کوردان کە لەلایەن رژێمی فاشی عێراقەوە کاولکراون.

لێرەدا؛ دەمەوێ دوو خاڵ بۆ خوێنەری خۆشەویست روون بکەمەوە:

١-لەم کتێبەدا باس لە راگواستن و بەعەرەبکردنی کوردستان کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی راگواستن شێوازێکی بەعەرەبکردنەو بەمەبەستی بەعەرەبکردنی کوردستان ئەنجامدراوە، بۆیە کتێبەکە ناوی (بەعەرەبکردنی کوردستان)ە.

٢-بەعەرەبکردن هەندێ جار بە (پاکتاوی نەژادی) باسی لێوەدەکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە (پاکتاوی نەژادی) دژی کورد ئەنجامدرابێت بۆ ئەوە بووە بەعەرەببکرێ، بۆیە دەستەواژەی (بەعەرەبکردن)م بەکار هێناوە، دواتر ئەو دەستەواژەیە (بەعەرەبکردن) بۆتە دەستەواژەیەکی سیاسیی و چۆتە نێو فەرهەنگی سیاسی کوردستان.

لەکۆتاییدا؛ هیوادارم بەم کارەم توانیبێتم خزمەتێکی بچوك پێشکەش بەنەتەوەکەم بکەم و هەندێ راستی بۆ نەوەی ئێستاو داهاتوو روون بکەمەوە. شارەزایانی بەرێزیش بەسەرنج و پێشنیارو لەسەر نووسین دەتوانن زیاتر کارەکەم دەوڵەمەند بکەن، لەبەر ئەوەی هیچ کارێك بێ کەم و کوڕی نابێت.

**غەفوور مەخمووری**

٢٠٠٢/٩/٢٧-٢٦

هەولێر - باشووری کوردستان

# بەشی یەکەم

# هاتنی عەرەب بۆ کوردستان

زۆربەی زۆری سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە تا پێش هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە (واتە کاتی فتوحاتی ئیسلامی) عەرەب لەناوچەکەدا بوونی نەبووەو، رووباری فرات سنووری نێوان کوردو عەرەب بووەو، عەرەب لەو بەرەی فراتەوە بوونیان نەبووە، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی فتوحاتی ئیسلام بۆ کوردستان لەساڵی ١٦ی کۆچی بەرامبەر ٦٣٧ی زایینیدا، عەرەب لەفرات پەڕیوەتەوەو هاتۆتە ناوچەکە. (تا هەزارەی یەکەمی پێش زایین هیچ بەڵگەیەك لەسەر بوونی عەرەب لەعێراقدا نییە)[1] بەڵام وەك ئاماژەم پێدا لەگەڵ هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە وردە وردە عەرەبیش روویان لەناوچەکە کرد. (هەڵکشانی عەرەب بۆ سەر عێراق لەسەردەمی فەتحی ئیسلامیدا لەسەدەی حەوتەمی زایینی دا گەورەترین رووداوە سەبارەت بەپێکهاتەی رەگەزی دانیشتوانی عێراق)[2].

موسڵ کە سەنتەری ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان) بوو، تا پێش هاتنی ئیسلام لە ١٦ی کۆچیدا (٦٣٧ی زایینی) تەنها سێ گەڕەك بووە (گەڕەکی زەردەشتییەکان، گەڕەکی یەهودییەکان و گەڕەکی مەسیحییەکان). بەڵام کە لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب دا هێرشی هۆزە عەرەبەکان بەسەرپەرشتی (عیاض بن غنم الاشعري)و (عمرو بن جند) بۆ ناوچەکە دەستی پێکرد، ژمارەیەك خێزانی عەرەب هێنرانە ناوچەکە، دیارە ئەو هاتنەی عەرەبەکانیش بێ بەرەنگار بوونەوە نەبووە، بەڵکو کورد بۆ بەرگریکردن لەخۆیو خاکی رووبەڕووی هێرشەکان وەستاوەتەوە، (عمرو بن جند)یش لەم هێرشانەدا کوژراوەو دوای ئەو خالیدی کوڕی وەلید هێرشی هێناوەو دوای شەڕەکە هۆزێکی عەرەبیان بەناوی (خەزرەج) هێناوەتە موسڵ و یەکەم گەڕەك و یەکەم مزگەوت بەناوی (خەزرەج) لەموسڵ دروستکراون.

---

١-جەزا تۆفیق تالب، بایەخی جیۆپۆلەتیکیی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق. . ل١٧٧.

٢-هەمان سەرچاوە.. . ل١٧٧-١٧٨.

هاتنی هۆزە عەرەبەکان بۆ ناوچەکە، جگە لەنیشتەجێبوونیان زیانی زۆریشیان بەدانیشتوانی ناوچەکە گەیاندووە (فەیلەسوفی ناسراوی عەرەب ئیبن خەلدون "١٣٣٢-١٤٠٦" لەو باوەڕەدایە کە عەرەب دەست بەسەر هەر ولاتیکدا بگرێت ویرانی دەکات، چونکە بەڕای ئەو عەرەب نەتەوەیەکی وەحشیە.. سروشتەکەیان ئەوەیە کە شتی ناو دەستی خەڵك بڕفێنن و رزقیان لەسایەی شمشێرەکانیاندایەو نەك هەر سل لەوە ناکەنەوە کە ماڵ و سامانی خەڵك بەرن، بەڵکە هەرکە چاویان بەماڵ و سامانی خەڵك کەوت تالانی دەکەن)[3][4].

هاتنی سوپای عەرەب بۆ کوردستان و تالانکردنی ماڵ و سامانی کوردو وێرانکردنی ولاتەکەی گیانی بەرەنگاربوونەوەی کوردی خورت کردووەو، کورد لەو سەردەمدا بەکۆمەڵێ راپەڕین و هێرش رابووەو بێ وەلام نەماوەتەوە. (کاتێك ئیسلام لەساڵی ١٨هـ "٦٣٩ز"دا گەیشتە کوردستان، کوردەکان ماوەیەکی دوورو درێژ دژی ئەم ئاینە نوێ یە جەنگان. تا ئەمڕۆش گەلەك گۆڕستان لەکوردستاندا هەن، کە هەندێکیان بەگۆڕستانی ئەسحابەو هەندێکی دی یان بەهی کافران[5] نێودەبرێن)[6].

لەسەردەمی موعتەسەم دوای مردنی مەئمون لەساڵی ٨٣٣ز-٢١٨ی کۆچی جەعفەری کوڕی حەسەنی داسنی کە مێرخاسێکی کورد بوو، لەدەسەلاتی ئەو کات یاخی بوو، بەردەوام لە بەرەنگاریدا بوو تاساڵی ٨٣٩ز لەشەڕێکی قورسدا لەچیای مەقلوب کوژرا. هەروەها لەسەردەمی (المکتفی باللّه) ٢٩٤ی ك ٩٠٦ی زایینی کە ئەوکات حەمدانییەکان فەرمانڕەوای موسڵ بوون، زوڵمێکی زۆریان لە کورد دەکرد، ئەوەبوو بارودۆخەکە تەقییەوەو محەمەدی کوڕی بیلال کە کوردێکی ناسراوی ئەوکات بوو لەدژیان راپەڕیو سەرپەرشتی راپەڕینێکی فراوانی کرد

---

٣- رەفیق سابیر، ئیمپراتۆریای لم.. ل٣٣.

٤- ئێستاش سوپای عەرەب وا رەفتار دەکات وەك ئەوەی کە لەساڵی ١٩٨٨ لەشالاوە بەدناوەکانی ئەنفالدا جگە لەوێران کردنی گوندو شارەکانی کوردستان ماڵ و سامانی کوردیشیان بەتالان دەبردو، تاکار گەیشتە ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆری ئافرەتەکانیشمان بەتالان ببەن و ١٨٢ هەزار مرۆڤیشمان بێ سەرو شوێن بکەن. هەروەها لەساڵی ١٩٩٠ لەکاتی گرتنی کوێت، سوپای عێراق کەوتە تالانکردنی ماڵ و سامانی خەڵکەکەو دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتەکانیان. (غ.م).

٥- گوڕستانی کافران، مەبەست لەگۆڕستانی ئەو کوردانەن کە لەشەڕی دژ بەئیسلامدا کوژراون.

٦- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی .. . ل٧٦.

لەدژیاندا[7][8] لەو سەردەمەدا پەیوەندیو تێکەڵی عەشیرەتیی لەلای کوردان بایەخی خۆی هەبوو زۆر جار هاوکاری یەکتریان دەکرد. (لەسەردەمی هێرشی عەرەبەکان لەسەدەی حەوتەم دا کوردستان چەشنە نەزمێکی هەرەوەزی تێدا مابوو و لادیێ کوردستان پێوەندییەکانی عەشیرەتگەری بۆ خۆی پاراستبوو)[9].

مامۆستا جەمال نەبەز لەکتێبەکەی (کوردستان و شۆڕشەکەی)دا باسی شەڕو شۆڕش و ڕووبەڕوو بوونەوەکانی کوردی بەرامبەر سوپای عەرەب کردووە. (مێژو ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کوردەکان لەزۆربەی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی دژ بەدەستەڵاتدارێتی دەوڵەتی ئیسلامییدا بەشدارییان کردووە)[10].

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە، نووسینەوەی مێژووی فتوحاتی ئیسلامی نییە، بەڵکو مەبەستمان لەهاتنی عەرەبە بۆ ناوچەکە، لەبەر ئەوەی عەرەبییش لەو سەردەمدا هاتۆتە ناوچەکە، بۆیە بەپێویستمان زانی کە باس لەچۆنیەتی هاتنیان و بەرەنگار بوونەوەیان بکرێت. دیارە ئەو شۆڕش و بەرەنگاربوونەوانەش لەدژیاندا بەردەوام درێژەی هەبووەو، زۆر لەمێژوونووسانیش باسیان کردووە. ئێمە لێرەدا زۆر بەکورتی لەسەر ئەم پرسە وەستاوین و دەتوانین بڵێین تەنها ئاماژە پێکردنێکی مێژووییە.

لەپاش فتوحاتی ئیسلامی بۆ ناوچەکەو هاتنی عەرەب بۆ کوردستان، بەپێویستی دەزانین کە باس لەدەسەڵاتدارێتی عوسمانییەکان و هێنانی عەرەب بۆ کوردستان بکەین ، دیارە پێش ئەوانیش لەسەردەمی (مەمالیك)دا (١٧٥٠-١٨٣١) ژمارەیەکی زۆر لەخێزانە عەرەبەکانی هەردوو عەشیرەتی، تەیو جبور هێنرانە ناوچەکە.

ئەوکاتەی مەدحەت پاشا والی بەغدا بوو (١٨٦٩-١٩١٤)و بەتایبەت لەساڵانی (١٨٦٩-١٨٧٢) هەوڵێکی زۆریدا بۆ نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبەکان لەسەر ئەو زەویو زارانەی کە بەناو هی دەوڵەت بوون[11] لەپێش هەمووانیشەوە هۆزەکانی (شەمەرو عنزەو دلێم و کعب)ی هێنا بۆ ئەو ناوچانەی کە پووش و پاوان و لەوەڕگای

---

٧-القس سليمان صائغ الموصلي، تاريخ الموصل، الجزء الاول. . ص٩٦-٩٧، ص١٢٥.

٨-محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان. . ل٩٥.

٩- دکتۆر عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد. . ل١١٩.

١٠- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . ل٧٦.

١١- الدكتور خليل اسماعيل محمد، اقليم كردستان العراق. . ص٤٣.

باشیان تێدا بوو. ئەوە بوو مەدحەت پاشا دەستی کرد بەنیشتەجێکردنی چەند خێڵێکی کۆچەری عەرەب (البدو) لەسەر زەوی‌و زارو پووش و پاوانی کورد، وەك ئەوەی کە عەشیرەتەکانی (رەبیعە، ئبن ئەوس، جبور) لەدەشتەکانی مەندەلی‌و بەلەدروزو قزلبات نیشتەجێکران و، عەشیرەتی بەیاتی لەنێوان کفری‌و توزخورماتوو، چەند تیرەیەکی کرێوی‌و لهێب لەدەشتەکانی قەرەتەپەو، عوبێدی لەناوچەی حەویجەی نێوان زێی بچوك و ئاوەسپی‌و، (شەمەرو ئەلبوحەمەدان و تەی‌و جبور لەدەشتی قەراج و شەرگات و گەیارەو هەندێك لەعەشیرەتی تەی‌و شەمەرو جبور)یش لەناوچەکانی تری موسڵ نیشتەجێکران[١٢]. بەم شێوەیە هۆزە عەرەبەکان لەسەر پاوان و زەوی‌و زاری کورد نیشتەجێکران.

ئەم نیشتەجێکردنەی عەرەبیش لەسەر خاکی کوردان بەخواستی کوردان نەبووەو لەزۆربەی کاتەکاندان عەرەبەکان زەوی‌و زاری کوردانیان داگیرکردووەو، بۆیە بەردەوامیش کورد لەگەڵ عەرەبدا لەڕووبەڕوو بوونەوەدا بووەو بەرەڤانی لەخاك و کەرامەتی خۆی کردووە. لێرەدا نامانەوێ بەدرێژی باسی شەڕو ڕووبەڕوو بوونەوەکان بکەین بەڵکو تەنها نموونەی لێدێنینەوە. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر سەرچاوە مێژووییەکان ئەوا زۆر بەڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە عەرەبەکان ویستوویانە ناوچە لەدوای ناوچەی کوردستان داگیر بکەن، بۆیە دەبینین لەدوای شاری موسڵ و دەوروبەری ڕوو لەدەشتی قەراج و هەولێر دەکەن، کە ئەوانیش دوو دەشتی بەپیت و فەڕن لەڕووی کشتوکاڵ و لەوەڕگاوە (لەڕووی نەوتیشەوە ناوچەیەکی گرنگەو بەسەدان بیرە نەوتی یەدەگی لێدۆزراوەتەوە). تا پێش هاتنی عەرەب بۆ سنووری لیوای هەولێر تەواوی دانیشتوانی لیواکە کورد بوون (هەموو خەڵکی لیوای هەولێر کوردن)[١٣].

دەشتی قەراج و مەخمووریش بەهەمان شێوە هەمووی کورد بوونەو عەرەبی لێنەبووە (هەرکەسێ لەقەزای مەخمووردا، کەمێ زۆرێ گەڕابێ، شارەزا بووە کە ئەو ئەرازییەی بەینی دوو زاب بەدەست عەشیرەتی دزەیی کوردەوەیە. کە لەزەمانی

---

١٢-کاوە نادر، کۆلۆنیالیزمی عێراقی‌و ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان، گۆڤاری سەرخۆبوون، ژمارە ٧و٨ هاوین و پاییزی ٢٠٠١ی کوردی. . . ل٣٠.

١٣- محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان. . . ل٢٩.

هەیدا نفوسەکەی بە ٣٠٠٠٠ سی هەزار کەس تەخمین کراوە)[١٤][١٥] دەسەڵاتی ئەو سەردەمیش لەپشت عەرەبەکان بووە بۆ هێنانیان بۆ سەر خاکی کوردستان و ڕێگەی بۆیان خۆش کردووە کە بەئاسانی لەدیجلەوە بپەڕنەوە (لەسەردەمی مەمالیك لەعێراقی عەرەبیدا "١٧٥٠-١٨٣١" کە مەرکەزیان شاری بەغدا بوو جۆرە سەربەخۆییەکیان لەدەوڵەتی عوسمانی ستاند بوو، بەو ناوەی عەشیرەتە عەرەبەکانی وەکو "شەمەرو، ئەبوحەمدان و تەی" مەڕانەو باجی حوشترانەیان دەدا بۆیە ڕێیان دەدرا لەزێی دیجلە بپەڕنەوە بۆ دەشتی قەراج و شەمامك و هەندێ جاریش بۆ کەندیناوەش بێن)[١٦]

بۆ بەرگرتن لەهاتنی عەرەب بۆ ناوچەکە خوالێخۆشبوو (برایماغای بایزاغای دزەیی) کە مێرخاسێکی عەشیرەتی دزەیی بوو، هەر خۆیشی لەساڵی ١٨٧٨ مەخمووری ئاوەدان کردبۆوە، (برایماغا مەخمووری بنیاتنا)[١٧]، دژی ئەو هاتنە وەستایەوەو سەرەتا بەشێوەیەکی ئاشتیانە ویستی لەڕێی دەسەڵاتی ئەوکات ئەو کێشەیە (کێشەی هاتنی عەرەب بۆ مەخموورو قەراج) یەکلایی بکاتەوە (برایماغا هەستا هەموو داواکارییەکانی خەڵکی ئەو ناوچانەی بەنووسین پێشکەش بەحکومەتی ویلایەتی موسڵ کردو، لەسەرووی هەموویانەوە نەهاتنی عارەب بوو بۆ ناوچەکانی قەراج و شەمامك و نەهاتنی جەندرمەی عوسمانی بوو بۆ وەرگرتنی باج و خەراج)[١٨]. وەك لەپێشدا ئاماژەمان پێدا دەسەڵاتی ئەو سەردەم خۆی هاوکاری هاتنی عەرەبەکانی دەکرد بۆ ناوچەکە، بۆیە وەڵامی داخوازییەکانی برایماغای دزەیی نادەنەوەو برایماغایش پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی هێز لەدژی دەسەڵاتی ئەو سەردەم و هێزێکی زۆر بۆ ئەم مەبەستە کۆدەکاتەوە (دبلیۆ. ئار .هی) کە خۆی سەردانی برایماغای کردووە ئاماژە بەوە دەکات کە (٦٠٠ سوارو ٤٤٠٠ چەکداری

---

١٤-هەمان سەرچاوە. . . ل٢٩.

١٥- دبليو. آر. هَي، سنتان في كردستان. . . ص١٠١.

١٦-کەریم شارەزا، برایماغای بایزاغای دزەییو بەربەستکردنی بەعارەبکردنی دەشتی مەخمور، گۆڤاری قەرەچووغ، ژمارە ٣و ٤ی پاییزو زستانی ٢٠٠٠. . . ل٤٨.

١٧-دبليو. آر. هَي، سنتان في كردستان. . . ص٢٠٤.

١٨-کەریم شارەزا، هەمان سەرچاوە. . . ل٢٩.

بەچەکەوە هەبووە)[19]. برایماغا بەم هێزەیەوە بەرەنگاری عەرەبەکان دەبێتەوەو بۆ سالانێکی زۆر شەڕی هۆزە عەرەبەکان و جەندرمەی تورك دەكات. (سالانێکی زۆر شەڕو کوشتاری لەگەڵ عەرەبە شەمەرەکان و تورکەکان هەبووە)[20]. لەئەنجامی ئەو شەڕو پێکدادانانەدا برایماغا بەسەر عەرەبەکاندا زاڵ دەبێت و لەناوچەکەدا وەدەریان دەنێت: (برایماغا پێش هەموو کارێکی عەرەبەکانی دیوی ڕۆژهەڵاتی دیجلە لەدەشتی قەراج و هەروەها شەمامك لەزێ دەپەڕێنێتەوە بۆ ئەوبەری دیجلەو زێیەکە دەکاتە سنوورێکی سروشتی لەنێوان خاکی کوردستان و نیشتمانی عەرەب "شەمەرو ئەلبوحەمدان و تەی"و هەموو نەخشەو پیلانێکی بەعەرەبکردنی دەشتی مەخموورو شەمامك پوچەڵ دەکاتەوە)[21].

پاش ئەوەی کە برایماغای دزەیی عەرەبەکانی لەناوچەکە دوورخستەوە، عەرەبەکان کەوتنە پیلان دانان بۆ ئەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە ناوچەکە، ئەوەبوو (حمود الهاوار) کە شێخێکی هۆزی تەی بوو کچێکی خۆی بەناوی (سەکتە) (کە دەکاتە دایکی کاك هاواری برایمی بایزاغای دزەیی) دەرازێنێتەوەو لەکەژاوەیەکدا بەدیاری بۆ برایماغای دزەیی دەنێرێ و ئەویش رازی دەبێت و دیارییەکەیان وەردەگرێت. پاشتر عەرەبەکان لەڕێی ئەوەی کە بوونەتە خزمی برایماغا هاتووچۆی دەکەن و داوای لێدەکەن کە ڕێیان بدات لەزێ بپەڕنەوە بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکانیان و بەس، برایماغاش بەڕەچاو کردنی ئەو خزمایەتییە ڕێیان پێدەدات کە دەربازی لەوەڕگاکانی دەشتی قەراج و مەخموور ببن[22]، بەمەبەستی بەخێوکردنی مەڕو ماڵات نەك نیشتەجێبوونیان. (نەقەراج و نەکەندیناوەو تاکو دەگەیشتە لینگاوە تاکە عەرەبێکیشی لێ نەبوو، هەروەها لەو کاتیدا مەخموور تاکو دەگاتە "سلطان عولا"ش تاکە کەسێکی عەرەبی لێ نەبوو هەموو هەر کورد بوون)[23].

---

١٩-دبلیو. آر. هَی، هەمان سەرچاوە. . . ص١٠١.

٢٠-هەمان سەرچاوە. . . ص٢٠٤.

٢١-کەریم شارەزا، هەمان سەرچاوە. . . ل٣٠.

٢٢-لەدیدارێکدا لەگەڵ مام هاواری برایمی بایزاغای دزەیی رۆژی ٢٠٠٢/٨/٢٨ ئەم زانیارییانەم لێ وەرگرتووە.

٢٣-دیدارێك لەگەڵ مامۆستا شێخ عەبدوڵلای گردەسۆری زانایەکی بەرزو مرۆڤێکی دڵفراوان، گۆڤاری خۆری ئیسلام، ساڵی چوارەم، ژمارە (٤٦) جۆزەردانی ٢٧٠٢. . . ل١٩.

عەرەبەکان کە بەمەبەستی مەڕ لەوەڕاندن (لەلایەن برایماغای دزەیی) ڕێیان پێدرا، بواریان نەدرایە خانوو دروست بکەن بەڵکو تەنها ڕەشمال نشین بوون.

پاش موسڵ و هەولێر؛ چاویان بڕییە ئەوەی کە دەربازی لیوای کەرکوک ببن و دەست بەسەر زەوی و زاری کورددا بگرن، پێش هاتنی ئەوان خەڵکی ناوچەکە هەمووی کورد بوون و عەرەبی لێ نەبووە (لەکەرکوکیش تاکو "دوز"یشی لەگەڵدا بێت، هەمووی هەر کورد بوون)[٢٤].

دەشتی کەرکوك و دەشتی گەرمیان جێی چاوتێبڕینی خێڵە عەرەبەکان بووە، دەسەڵاتی ئەوکاتیش لەپشت هاتنی عەرەبەکان بووە بۆ ناوچەکە بەتایبەت دوای ئەوەی کە ساڵی ١٨٩١ (سێر ولیەم دارس) نەوتی لەکەرکوك دۆزییەوە، لەگەڵ ئەوەی کە شاڵاوێکی زۆری عەرەب رووی لەناوچەی کەرکوك کرد بەڵام نەیانتوانی سیمای کوردانەی دەڤەرەکە بگۆڕن و، بەردەوام چ لەناو شارو چ لەدەوروبەری شاردا ژمارەی کورد لەهەمووان زیاتر بووە (زۆربەی هەرەزۆری ئەو عەشیرەتانەی کە دانیشتووی لیوای کەرکوکن عەشیرەتی کوردن. ئەمانەش بەزۆری لەناوەڕاستی لیواکەو لەلای ڕۆژهەڵات و باکووریدا نیشتەجێن)[٢٥].

دیارە لێرەدا من نامەوێت باس لەکوردستانی بوونی کەرکوك بکەم، لەبەر ئەوەی هیچ گومان لەوەدا نییە کە کەرکوك شارێکی کوردی و کوردستانیەو زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوە مێژووییەکانیش ئەم ڕاستیەیان سەلماندووە. لەبەرئەوەی ناوچەیەکی بەپیت و فەرە لەڕووی نەوت و گازی سروشتی و کشتوکاڵ و، ئەمە وای کردووە کە زۆر لا چاوی تێبڕن (لەبەشی بەعەرەبکردنی کوردستان بەدرێژی باس لەشاڵاوەکانی بەعەرەبکردنی ئەم شارەی کوردستان دەکەین). عەرەب پێشووتریش دەستی بەسەر (عیمارەو کوت و تکریت و دیالی "دێی باڵا") داگرتبوو و، تێدا نیشتەجێ ببوون، کە ئەم شارانەش پێشووتر بەشێك بوونە لەکوردستان و هی کورد بوونە.

بەم شێوەیە وردە وردە تا دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق (داتاشینی دەوڵەتی عێراق) لەساڵی ١٩٢١دا عەرەب ڕوویان لەناوچەکە کردو لەهەندێ شوێندا تێیدا

---

٢٤- هەمان سەرچاوە.

٢٥-عبدالمجید فهمي حسن، دلیل تأریخ مشاهیر الألویة العراقیة، الجزء الثاني، ص٦٠.

نیشتەجێبوون، کە ئەمەش شێوازێکی سەرەتایی بەعەرەبکردنی کوردستان بوو (تەعریب لەسەرەتای دەرچوونی عەرەب لەنیوە دوورگەی عەرەبی دەستی پێکردووەو، هەتا ئێستا بەڕاست و چەپدا بەردەوامە)[٢٦]. ئەوە شێوازێکی سەرەتایی بەعەرەبکردنی کوردستان بووە. لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان شێوازێکی تری وەرگرت، کە لەلایەن دەوڵەتەوە پیلانڕێژی بۆ دەکراو، بەهاوکاریو پشتگیری دەوڵەت و بەمەبەست عەرەب دەهێنرانە ناوچەکەو تێیدا نیشتەجێدەکران.

---

٢٦-مەلا عبداللطیف بامۆکی، تەعریب سەرچاوەی هەموو تارانەکانە، گۆڤاری خۆری ئیسلام، ساڵی چوارەم، ژمارە (١٦) جۆزەردانی ٢٧٠٢.

# بەشی دووەم
# قۆناغەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان

لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە ١٩٢١دا, دەسەڵاتدارێتی عەرەبی عێراقی کەوتە فراوان کردنی دەسەڵاتەکەیو هەوڵدان بۆ پارێزگاری کردن لەو یەکە داتاشراوە (عێراق) نوێیەو جێگیرکردنی سنوورە جوگرافیاکەیو کارکردن بۆ دەستبەسەراگرتنی ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان), حکومەتی ئەوکاتی عێراق کەوتە کارکردن بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەی پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان بۆ بەرژەوەندی چینی دەسەلاتداری عەرەب[٢٧]. بۆ ئەم مەبەستەش دەستی کرد بەدروستکردنی کۆمەڵێ (مستوطنات)ی سەرەتایی بۆ نیشتەجێکردنی هۆزە کۆچەرەکانی عەرەب (البدو)[٢٨] و هانی دان کە ڕوو لەناوچەکە بکەن. (دانیشتوانی عەرەب خەڵکی رەسەنی ناوچەکەنین بەڵکو کۆچەرن, لەشوێنی ترەوە بۆ هەرێمی کوردستان هاتوون)[٢٩], هێنانی عەرەب بۆ سەر زەویو زاری کورد بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتنی خاك و نیشتمانی کورد بووە, لەبەر ئەوەی حکومەتی تازە دامەزراوی عێراق باش هەستی بەوەکردبوو کە کورد لەگەڵیدا نیەو وڵاتەکەشی بە بەشێك لەعێراق نازانێت, ئەمەیش بەروونی لەکاتی دەنگدان بەمەلیك فەیسەل بۆ پاشایەتی عێراق وەدەرکەوت کە (کەرکوك بەرهەڵستی دانانی فەیسەل بوو, و سولێمانیش لەئەساس دا بەشداری لەریفراندۆکەدا نەکرد)[٣٠], هەرچی هەردوو لیوای موسڵ و هەولێریش بوون ئەوا بەمەرج دەنگیان بەفەیسەل دا[٣١] مەرجەکەش بریتی بوو

---

٢٧- الدکتور خلیل اسماعیل محمد، مؤشرات سیاسة التعریب والتهجیر في اقلیم کردستان العراق. . . ص١.

٢٨- الدکتور خلیل اسماعیل محمد، أقلیم کردستان العراق. . . ص٨٠.

٢٩- جەزا تۆفیق تالب، بایەخی جیوپۆلەتیکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق. . . ل١٧٩.

٣٠- دکتۆر عبدالرحمن قاسملو، کوردستان وکورد . . . ل٧٦.

٣١- سەلام ناوخۆش، هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبیەوە، . . . ل١٠٤.

لەپاراستنی مافی کورد (جێبەجێکردنی پەیمانی سیڤەر)[٣٢] خەڵکی کوردستان باوەڕیان وابوو لەبەر ئەوەی کوردستان بەشێك نییە لەعێراق مافی ئەوەیان نییە بڕیار لەسەر دانانی مەلیك بدەن و دەنگ بۆ دانانەکەی بدەن، بۆ نموونە خەڵکی سلێمانی بەروونی ئەمەی راگەیاندووە (چونکە لیوای سلێمانی جیاوازە لەحکومەتی عێراق، پێویست نیە رەئی بدەن بۆ دانانی مەلیك.)[٣٣]، وردتر هەر لەبنەڕەتەوە کورد نەیویستووە لەگەڵ عەرەبدا لەچوارچێوەی دەوڵەتێکدا بژێت. (نایانەوێ کوردستانی جنوبی بخرێتە سەر عێراق و، نایانەوێ لەگەڵ عەرەب دا لەچوارچێوەی یەك دەوڵەتدا پێکەوە بژین)[٣٤] ئەمە هەڵوێستی روونی کوردبووە بەرامبەر لکاندنی بەشێکی وڵاتەکەی بەعێراقی عەرەبییەوە، ویلایەتی موسڵ کە بریتییە لەباشووری کوردستان دانیشتوانەکەی تەواوی کورد بوونە (ویلایەتی موصل، کە بەئیعتباری عمومی کوردە..)[٣٥] ویستوویانە خۆیان حاکمی خۆیان بن و نەکەونە بن دەستی بێگانە، باش هەستیان بەوە کردووە کە (مولحەقاتی ویلایەتی موسڵ کامیلەن موڵکی کوردو میلەتی کوردە)[٣٦]. پاش بینەو بەردەیەکی زۆرو بێ خواست و بێ رازیبوونی کورد ویلایەتی موسڵ لەساڵی ١٩٢٥دا بەعێراقی عەرەبییەوە لکێنرا، بێگومان دوای ئەوەش کە ویلایەتی موسڵ بەعێراقەوە لکێنرا، کورد دەستبەرداری خاکی خۆی نەبووەو نابێت ئەوەتا (شێخ مەحمودی حەفید) لەنامەیەکیدا بۆ سەرۆکی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەوکات (عصبة الامم) زۆر راشکاوانە دەڵێت: (لەراستیدا بەنیسبەتی ئەوەی کە نیشتمانی ئێمە بەئێراقەوە بلکێندرێ‌و بەزۆری چەك ئەم گرێدانە بەئێمە بسەلمێندرێ، ئاشتی‌و هێمنی کەویستی ئەم کۆمەڵە بەرێزەیە بەهیچ شێوەیەك لەم گۆشە لەدنیادا دابین نابێ! هەتا کاتێك کەچارەنووسی نیشتمانی کورد بەدەستی رۆڵەکانی خۆی نەسپێررێ‌و تا زەمانێك دەوڵەتێکی کوردی بەڕێوەبەری بەشە کوردستانیەکەی ئەم ناوچەیە نەگرێتە دەست، هیوای ئەوە ناکرێ کە ئاشتی‌و

---

٣٢- جەلال جەوهەر، (٨٠) ساڵ تەعریبکردنی کوردستان، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٤ بەهاری ٢٠٠٠ .ل٣٦.

٣٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی رۆژنامەگەری کوردی، بەرگی دووەم. . ل٩٠.

٣٤- هەمان سەرچاوە. . . ل١٩٧.

٣٥- هەمان سەرچاوە. . . ل٢٠٨.

٣٦- هەمان سەرچاوە. . . ل٢١١.

هێمنی لەو مەڵبەندەدا بەدی بێ.)[٣٧] بۆ هەموو لایەك ئاشكرایە كەوا لەرۆژی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە تائێستا عێراق ئاسایش و ئارامی بەخۆیەوە نەبینیوەو باری ناوخۆی سەقامگیر نەبووە, لەبەر ئەوەی هەر لەسەرەتاوە عێراق بەناكاملی داتاشراو، داتاشینەكەشی لەسەر حسابی میللەتی تربوو, شتێكی ئاسایی‌و مافێكی رەوای هەر میللەتێكە كە بەرەڤانی،لەخاك و كەرامەتی خۆی بكات.

نەتەوەی كوردیش باش درکی بەوە كردووە كە داتاشینی عێراق و پێوە لكاندنی بەشێكی كوردستان بەعێراق مەترسییەكی گەورەیە بۆ سەر دوارۆژی نەتەوەیی, بۆیە بەردەوام لەشۆڕش و راپەڕیندا بووە بۆ وەرگرتنەوەی مافی زەوتكراوی خۆی. دیارترین شۆڕش و راپەڕینەكانیش لەوكاتدا شۆڕشەكانی بارزان و شۆڕشەكانی شێخ مەحموودی حەفید بوون[٣٨]. هەر لەو كاتیشدا داگیركەرانی كوردستان كە تازە كوردستانیان بەسەردا دابەش كرابوو (بەپێی پەیمانی سایكس پیكۆ لە ١٩١٦دا كوردستان دابەشی سەر هەریەك لەعێراق و ئێران وتوركیاو سوریا كرا). هاوكاری یەكتریان دەكرد بۆ لێدانی شۆڕش و سەرهەڵدانەكانی كورد. كەناڵەكانی راگەیاندن بەشێوەیەكی بەردەوام باسیان لەراوە دوونانی كۆمەڵانی خەڵكی سەر سنووری تورك و فارس و عێراق دەكرد كە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتانەوە تووشی راوەدوونان دەربەدەری ببوونەوە[٣٩]

نەتەوەی كورد لەگەڵ ئەوەدا بووە كە بەردەوام پارێزگاری لەوڵاتی خۆی بكات و نەهێڵێ بكەوێتە دەست عەرەبەوە (ئێمە ئامادەین و هەمیشە ئامادە دەبین لەبەرامبەر عەرەبان پارێزگاری لەنیشتمانی خۆمان بكەین)[٤٠]. بەم شێوەیە بەلكاندنی باشووری كوردستان بەعێراقەوە بەعەرەبكردنی كوردستان فۆرمێكی تری پێ بەخشراو بەفەرمی باشووری كوردستان كرایە بەشێك لەعێراقی عەرەبی, بێ گوێدانە ئیرادەی نەتەوەیی كوردو ناڕازیبوونی تەواوی خەڵكی باشووری كوردستان، دوای ئەوەی كە

---

٣٧- دەقی نامەی شێخ مەحموود بۆ سەرۆكی كۆمەڵەی نەتەوە یەكگرتووەكان، ئاڵا- ئۆرگانی پارتی سەربەخۆیی كوردستان، ژمارە (٥)، ساڵی حەوتەم، رەشەمی ١٩٩٣. .. ل٦-٧.

٣٨- عزيز حسن البارزاني، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق ١٩٣٩-١٩٤٥، . . . ص٣٦-٣٧.

٣٩- الامير جلادت بدرخان، حول المسألة الكوردية قانونٌ ابعاد وتشتيت الاكراد ، ص٣.

٤٠- نامەی شێخ مەحموود بۆ سەرۆكی كۆمەڵەی نەتەوە یەكگرتووەكان، هەمان سەرچاوە. . . ل٦.

عێراق ئەوەی بۆ چووە سەر ئیتر کەوتە پیلان گێڕان بۆ بەعەرەبکردنی تەواوو یەکجارەکی باشووری کوردستان، ئەمەشی بەچەند قۆناغێك ئەنجامدا، کە لێرەدا ئاوا قۆناغبەندمان کردووە:

- قۆناغی یەکەم ١٩٢٥- ١٩٥٨ سەردەمی پاشایەتی.
- قۆناغی دووەم ١٩٥٨- ١٩٧٤ سەردەمی کۆماری.
- قۆناغی سێیەم ١٩٧٤- ١٩٩٠ سەردەمی بەعس
- قۆناغی چوارەم ١٩٩١- تائێستا (دوای راپەرین)

لێرەدا بەکورتی باس لەبەعەرەبکردنی کوردستان بەپێی ئەم قۆناغانەی سەرەوە دەکەین، لەبەر ئەوەی هەر قۆناغێك پێویستی بەکتێبێکی سەربەخۆ هەیە، ئەگەر لەهەموو روویەکەوە لێیبکۆڵرێتەوە:

# قۆناغی یەکەم

## ١٩٢٥- ١٩٥٨ سەردەمی پاشایەتی

ساڵی ١٩٢٥ کە ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان) بەعێراقەوە لکێنرا, لەوێوە بەعەرەبکردنی کوردستان بەشێوازێکی تر دەستی پێکرد, هەر لەو ساڵەدا (١٩٢٥) عێراق کابرایەکی نیشتەجێی موسڵی بەناوی (مستەفا عومەری) کردە وەزیری ناوەخۆی عێراق و, ئەویش دەستیکرد بەپیلان گێران بۆ هێنانی عەرەب بۆ ناوچەکە، ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆری لەخێزانە کۆچەرەکانی هۆزی (سمبس)ی عەرەبی هێنا دەشتی قەراج و ژمارەیەکی زۆریشی لەخێزانە کۆچەرەکانی تەی‌و جبوور هێنا موسڵ و دەوروبەری. ساڵی ١٩٢٩ (کەنعان صدید) بەپشتگیری دەسەلاتی عێراق رووی کردە گوندی شەعەل و گورگە. تا ساڵی ١٩٣٠و ١٩٣٥ دەسەلاتی عێراق بەردەوام هاوکاری خێلە کۆچەرە عەرەبەکانی دەکردو هانی دەدان کەوا روو لەکەرکوك و دەوروبەری کەرکوك بکەن و تێیدا نیشتەجێبن. دواتر دەسەلاتی عێراق بەرەسمی دەستی بەبیناکردنی چەند پرۆژەیەکی ئاودێری کرد بەمەبەستی نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبەکان وەك پرۆژەکانی (اللطيفية, الدجيلة, المسيب, الحويجة, و مشروع الجزيرة)[٤١]

پاش ئەوەی کە نەوت لەکەرکوك دۆزرایەوە بایەخی ستراتیژی شوێنی کەرکوك بۆ دەسەلاتی عێراقی روون بۆوە, هەولیدا بەزووترین کات کۆنترۆڵی ناوچەکە بکات, ئەوەبوو لەپرۆژەی حەویجەدا لەساڵی ١٩٣٦ زیاتر لە ٢٠٠٠٠ بیست هەزار ماڵە عەرەبی کۆچەری لەهۆزەکانی (العبيد و تەی لەو ناوچەیەدا نیشتەجێکردو, زەمینەشی خۆشکرد کەوا هۆزەکانی (لهیب و کرێوی) لەدەشتی قەرەتەپەو هۆزەکانی (جبورو تەی) لەدەشتی قەراج و باکووری رۆژهەلاتی حەویجەدا نیشتەجێبن[٤٢].

لەکاتی نیشتەجێبوونی عەرەبەکاندا دەسەلاتی عێراق بەزووترین کات بیری ئاوی بۆ لێدەدان و هەندێ جار زەویشی پێدەدان, ئەگەرنا ئەوا عەرەبەکان خۆیان زەوی‌و زاری جوتیارانی کوردیان داگیردەکرد.

---

٤١- الدكتور خليل اسماعيل محمد، مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق. . . ص١.

٤٢- هەمان سەرچاوە. . . ص١٤.

عەرەب بەردەوام بەپاڵپشتی دەسەلاتی عێراق هەوڵی داوە لەناوچەکەدا نیشتەجێ بێت و ژمارەیەکی زۆری خێزانی عەرەب لەحەویجەو داقوق و تازە خورماتوو و دەوروبەری کەرکوك نیشتەجێکران.

دەسەلاتی عێراقی لەگەڵ ئەوەیدا, کە عەرەبی دەهێنانە سەر خاکی کوردستان, کاری بۆ وێران کردنی کوردستانیش دەکرد (لە ١٩٣٣- ١٩٣٤ بۆ دامرکاندنەوەی راپەرینی بارزان, هێزی سوپای عێراق و بەریتانیا کەوتنە هێرش و وێران کردن, تەنیا لەناوچەکانی بەرۆژ, مزوریو شێروان ٧٩ گوند وێران کران, لەسەرجەمی ٢٣٨٢ خانووبەرە ١٣٦٥ خانوویان سوتاندو رووخاند, واتە ٦٠٪ وێران کرا)[٤٣] بەعەرەبکردنی کوردستان لەسەردەمی پاشایەتیدا زیاتر ناوچە دەوڵەمەندەکانی کوردستانی گرتۆتەوەو دەسەلات هەوڵیداوە ناوچە گرنگ و ستراتیژییەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆی. لەسالانی چلەکاندا دەسەلاتی عێراقی هەزاران کەسی لەخەڵکی مەندەلیو خانەقین و قەرەخان (جەلەولا- گولاڵە)و کوت و بەدرەو جەسان دەربەدەری ئێران کردو عەرەبی هێنا شوێنیان, ئەم ناوچانەش هەر هەموویان ناوچەی گرنگن چ لەرووی نەوت و چ لەرووی کشتوکاڵەوە بێت. هەروەها فەیلییەکانیش بەبیانووی (پاشکۆیەتی ئێران)[٤٤] لەشارەبان و قزلبات و جەلەولاو خانەقین و مەندەلیو نەفتخانەو قزانیەو بەدرەو جەسان دەربەدەری ئێران کران[٤٥].

لەساڵی (١٩٤٠- ١٩٥٠) لیژنەیەك بەناوی (لجنة تصفية الاراضي) لەلایەن حکومەتی عێراقەوە پێکهێنراو بەپێی بەرنامەی لیژنەکە زەویو زارێکی زۆر لەکورد سەنرانەوەو کران بەموڵکی دەوڵەت و پاشتر دران بەعەرەب و, ساڵی ١٩٤١ رەشید عالی گەیلانی کەوتە دوور خستنەوەی کورد لەسەر زەوییو زاری خۆی و هێنانی عەرەب بۆ جێگەیان. (هەر لەچلەکاندا حکومەتی عێراق بەڕێوەبەرایەتیەکی بەناوی "مديرية العشائر العامة" کە سەر بە وەزارەتی ناوەخۆبوو دامەزراندو هۆبە یەکیشی بەناوی "الاسكان الريفي" دامەزراند)[٤٦] هەم بەڕێوەبەرایەتییەکەو هەم هۆبەکەش

---

٤٣- د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد. . . ل٢٢.

٤٤- بەپێی یاسای رەگەزنامەی عێراقی ساڵی ١٩٢٥ فەیلییەکان بە (تەبەعیەی ئێران) لەقەڵەم دراون.

٤٥- الدكتور خليل اسماعيل محمد، مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق. . . ص١٨.

٤٦- هەمان سەرچاوە . . . ص٨.

کەوتنە کارکردن و ژمارەیەکی زۆری عەرەبیان هێنا کوردستان و لەساڵی ١٩٤٨ بەناوی (توطين العشائر) کۆمەڵێك (مستوطنات)یان بۆ هۆزە عەرەبەکان لەدەشتی تەلەعفەرو شنگال و حەزەردا دروستکردو عەرەبیان تێدا نیشتەجێکرد, عەرەبەکانیش زۆربەیان بەدو بوون و زەوی‌و زاری کوردیان پێ بەخشراو کەوتنە کاری کشتوکاڵی بۆ خۆیان.

هەروەها لەچلەکاندا دەشتی قەراجیش کە دەشتێکی دەوڵەمەندە چ لەرووی زۆری چاڵە نەوتە یەدەگەکان و چ لەرووی کشتوکاڵییەوە بێت بووە جێگەی چاوتێبڕینی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق و, ویستی کێشە بۆ ناوچەکە دروست بکات و هەوڵیدا کەوا عەرەب بۆ ئەوێش بهێنێت (حکومەتی عێراق دەیویست ئەم دەشتە, کە سەر بەپارێزگای هەولێرەو کورد لەسەری دەژی, بدا بەدەرەبەگێکی عەرەب کە نێوی سەفوك ئەلیاوەر (صفوك الياور)ە, بۆ ئەوەی لەلایەکەوە دڵی سەفوك رازی بکات, و لەلایەکی دیشەوە بەشێك لەووڵاتانی کورد ببەستێ بەنێوچەی شیرقات (شرقاط)ەوە کە لەسەر مووسڵەو پێتەختەکەی بەدەست عەرەبەکانەوەیە)[٤٧] حکومەتی عێراق لەم رێیەوە دەیویست کێشە بۆ دەشتی قەراج دروست بکات و نەهێڵێت کورد بەتەنها لەناوچەکەدا نیشتەجێبن. (خەڵکەکەی دەشتی قەراج هەموو کوردن و بەمە تووشی گێرەو کێشە دەبوون. بێجگە لەوەش دەشتی قەراج بۆ پارێزگەی هەولێر زۆر پێویست بوو, چونکە مەڕو ماڵاتی هەولێر لەوێدا دەلەوەڕان)[٤٨]. حکومەتی عێراقی بەردەوام کاری کردووە بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان, لەساڵی ١٩٥١ لیژنەیەکی بەناوی (لیژنەی نیشتەجێکردنی هۆزە کۆچەرەکان) پێکهێناو لەرێی ئەم لیژنەیەوە بەهەزاران ماڵە عەرەبی لەسەر زەوی‌و زاری کوردان نیشتەجێکردو هەر ماڵە عەرەبێکیش (١٥٠) دۆنم زەوی پێدەدراو بیری ئاویشی بۆ هەڵدەکەنرا. بۆ ئەم مەبەستەش عەرەبەکانیان دەهێنا ئەو دەشتانەی کە بۆ کشتوکاڵ کردن بەپیت بوون (دوای نەوت, کشتوکاڵ گەورەترین کەرتی ئابووری پێك دەهێنێ)[٤٩]. بۆیە عەرەبەکانیش و حکومەتی عێراقیش چاویان بڕیبووە دەشتی حەویجەو دەشتی قەراج و قەرەتەپە (دەتوانین

---

٤٧- جەمال نەبەز، گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتیی تێکۆشین. . ل١٢٣.

٤٨- هەمان سەرچاوە. . .

٤٩- د.عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیای کوردستان. . ل٢٩٥.

دەشتی حەویجە بەدەشتی قەراج-ی باشووری پارێزگای هەولێرو دەشتی قەرەتەپەی باشووری قەزای کفری پارێزگای کەرکوك بچوێنین)[٥٠].

حکومەتی عێراق لەپاش پرۆژەی حەویجە، لەسالی ١٩٤٥ تا ١٩٥٨ بە بەردەوامی عەرەبی هێناوەتە ناو کەرکوك و دەوروبەری، هەروەها ژمارەیەکی زۆریان لەخێزانە کۆچەرەکانی هەردوو عەشیرەتی (حەمدانی و کلیبات) هێنا بۆ پرۆژەکانی حەویجەو شنگال و دوجیل (لەماوەی نێوان ١٩٥١- ١٩٦٥)دا نزیکەی ٤٠٠ گوند "مستوطنات- غ.م" بۆ عەرەبە نیشتەجێ کراوەکان لەنێوان شنگارو حەمزەر دروست کران کە نزیکەی ٤٧٤٠٠ کەس تێیدا دەژیا لەباکوری رۆژهەڵاتی چیای شنگاریش ژمارەی گوندە دروستکراوەکان گەیشتە ١٥٢ گوند، جگە لە ١٧٢ گوند لەناحیەی شنگار کە ٣٢٢٠٠ کەسی تێدا دەژیا)[٥١]. بەم شێوەیە حکومەتی عێراق ژمارەیەکی زۆری لەعەرەبی کۆچەر هێنا ناوچەکەو نیشتەجێی کردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ساڵی ١٩٥٧یش رێژەی دانیشتوانی کورد لەشنگال ٨٠٪و لەشێخان-یش ٧٠٪ بوو. بەم شێوەیە، لەسەردەمی پاشایەتیداو تارووخانی پاشایەتی لە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا بە بەردەوامی هەوڵدراوە بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان و هێنانی عەرەب بۆ سەر خاکی کوردان.

---

٥٠- الدكتور نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي . . . ص٤١.

٥١- جەزا تۆفیق تالب، بایەخی جیوپۆلەتیکیی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق. . ل١٧٩.

# قۆناغی دووەم

## ١٩٥٨- ١٩٧٤ سەردەمی کۆماری

دوای ئـەوەی لەکودەتایەکـدا لـە ١٩٥٨/٧/١٤ رژێمـی پاشـایەتی عێـراق رووخـاو رژێمێکی کۆماری راگەیەنرا, گـەلی کـورد بەئومێدەوە چاوەڕوانی پێشهات و ئـەنجامی ئـەو گۆڕانکارییـەی دەکـرد, بـەڵام شـۆڤێنیەتی عـەرەب نەیهێـشت ئومێـدەکانی کـورد بێنـەدی‌و, هـەر زوو دەسـەڵاتی عێراقـی گەڕایـەوە سـەر سیاسـەتی بەعـەرەبکردن و وێرانکردنی کوردستان و بەتاڵان بردنی ماڵ و سامانی کورد، لـە ١٩٥٩/٧/١٥دا چەند یەکەیەکی سەربازی لەبەغداوە هێنرایـە کـەرکوک و کۆمـەڵێ کاری ناڕەوایان ئەنجامدا کە تائێستا شوێنەواری سلبی بەسەر کـەرکوک و ناوچەکەوە دیـارە[٥٢]. دواتر کەوتنـە ئاژاوەنانەوە لەنێوان کوردو تورکمان بۆ ئەوەی کوردی پێ تاوانبار بکـەن و, زەمینـەی گرتن و راوە دوونـانی کـورد خـۆش بکـەن, حکومـەتی عێـراق بـاش بایـەخی ئـابووری‌و سـتراتیژی کـەرکوکی دەزانـی بۆیـە زیـاتر چـاوی لەسـەر ئـەو شـارە بـوو, لەهـەموو لایەکەوە هانی عەرەبی دەداو هاوکاری دەکردن کـە بـۆ شـاری کـەرکوک بێن, لەدەشتی قەراج–یش کوردی گوندەکانی (کودیلە, کەبەرۆک, سـەیداوە, شـێرکوژرای, ئۆمـەراوە, خرەبەردان, رواڵـە, لاکەچـە, بنـدیان, دۆرەنگیـۆ, پاشـبەند, دۆمـەدریس, خەرابەزەردو چـەندان گونـدی تـر)یـان راگواسـت‌و عـەرەبیان هێنـا شـوێنیان و, لـە ١٩٦٠- ١٩٦١ (عەبدولکـەریم قاسـم) بڕیاریـدا کـەوا گونـدەکانی دەوروبـەری کـەرکوک رابگـوازن و ژمارەیـەکی زۆر لەگونـدەکانیان راگواسـت و عـەرەبیان هێنـا شـوێنی ئـەوان. (هـاوینی ١٩٦١ رژێمی عبدالکریم قاسم هێرشی کردە سەر کوردستان و نیوەی زیاتری سـوپای عێراقی بەهێرش لەدوای هێرش بەردایە سەر دانیشتوان, تا لـەماوەی سـاڵ و نیوێکـدا نزیکەی "٣٠٠٠" سێ هـەزار کـەس کوژران, کە زۆربەیان خـەڵکی مەدەنی بوون. زیـاتر لـە "١٠٠,٠٠٠" سـەد هـەزار ئـاوارەبوون و کـەوتنە چیا, "١٥٠" سـەدو پـەنجا گونـدو شار وێـران کـران)[٥٣] زوڵـم و زۆری رژێمـی عێـراق و سـوپاکەی رۆژ بـەرۆژ لەبەرامبـەر کورد روو لەزیادبوون بوو, بۆیە گـەلی کـوردیش وەك وەڵامێـك و بەرەنگاربوونەوەیـەکی

---

٥٢- الدكتور نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي. . . ص٥١.

٥٣- د.عارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد. . . ل٢٢-٢٣.

سیاسەتی قڕکردنی کوردو وێران کردنی کوردستان دەستی بەشۆڕش کردو, لە ١٩٦١/٩/١١ شۆڕشی ئەیلول بەڕێبەرایەتی ڕێبەری گەورەی کورد (مستەفا بارزانی نەمر) هەڵگیرسا.

بێگومان بەعەرەبکردنی کوردستان پیلانێکی فاشییانەی ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراقە بۆ سڕینەوەو نەهێشتنی نەتەوەیەک بەخاك و خەڵکەوە, بۆیە دەستیان لەقڕکردن و وێرانکردنی خەڵك و خاکی کوردستان نەپاراستووەو هێرشیان کردۆتە سەر تەواوی شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستان. لەگەڵ بەردەوام بوون و پەرەسەندنی شۆڕشی ئەیلولدا ڕژێمی عێراق زۆر کوێرانە شارو گوندەکانی کوردستانی دەکوتاو ساڵی ١٩٦١ و ١٩٦٢ هێرشی زۆر توندیان کردە سەر گوندەکانی دەوروبەری کەرکوك و کەندێناوە وەك ئەو هێرشەی کە لە ١٩٦٢ کرایە سەر (سەر بەشاخ).

لە ١٩٦٣/٢/٨دا کاتێ بەعسییەکان هەڵسان بەکودەتایەکی سەرنەکەوتوو, ئەوە بوو لەو ساڵەدا زوڵمێکی زۆریان لەکورد کرد. پاش کودەتای شوباتی ١٩٦٣ بەعسییەکان لەشالاوێکی ڕێکخراودا کەوتنە گرتن و ڕاوە دونان و دژایەتی کورد, کەبووە هۆی دەربەدەرکردنی هەزاران کەس[٥٤]. هەر لەحوزەیرانی ئەو ساڵەدا سوپای عێراق بەهاوکاری (الحرس القومي) هێرشێکی زۆر دڕندانەیان کردە سەر تەواوی کورد[٥٥]. شاری کەرکوکیش لەساڵی ١٩٦٣دا زۆر بەتوندی کەوتە بەر شالاوی بەعەرەبکردن[٥٦]. هەروەها سوپای عێراق دەستی بە پەلامارو بۆمبارانی دانیشتوانی بێ دیفاعی کوردستان و سووتاندنی گوندەکانیان کرد[٥٧]. ساڵی ١٩٦٣ ڕژێمی عێراق بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە کەوتە خاپوورکردنی کوردستان (لە ١٩٦٣/٦/١١ەوە تا ١٩٦٣/٧/٢٣ تێکڕا ٨٧٥ گوندی کورد خاپوور کران)[٥٨]. لەو ساڵەدا سوپای عێراق دەربازی قوڵایی خاکی کوردستان ببوو, زۆر شوێنی داگیرکردبوو, بەڵام هێزی

---

٥٤- الدكتور نوري طالباني، سەرچاوەی پێشوو. . . ل٥٥.

٥٥- هەمان سەرچاوە. . . ل٥٦.

٥٦- وريا الجاف، كركوك دراسة سياسية واجتماعية، . . . ص١٣٩.

٥٧- دکتۆر عبدالرحمن قاسملو، کوردستان وکورد. . . ل٣٤٤.

٥٨- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی . . . ل٢٣٤.

پێشمەرگەی کوردستان بەشێوەیەکی زۆر دلێرانە رووبەرووی ئەم هێرشانە وەستایەوەو (لە دیسەمبەری ١٩٦٣دا پێشمەرگەکانی کورد هەموو ئەو نێوچانەیان گرتەوە کە لەسەرەتای شەڕی بەعس دا لەدەستیان دابوو.)[٥٩]، رژێمی عێراق جگە لەهێرش و پەلامارەکانی هەوڵیدەدا لەرووی یاسایی و ئیداریشەوە کار بۆ دابڕینی کوردستان و بەعەرەبکردنی بکات، وەك ئەوەی لە ١٩٦٣/٧/١دا کە (یاسای پارێزگاکانی) بلاوکردەوە عێراقی دابەشی سەر پێنج پارێزگا کردبوو، یەکێك لەوانە پارێزگای سلێمانی بوو کە هەولێرو دهۆك و سلێمانی دەگرتەوە (شاری پڕ نەوتی کەرکوك و خانەقینی سەر سنوور و نێوچەی شێخان و سنجاری یەزیدییەکانی تێدا نەبوو)[٦٠] هەر لەساڵی ١٩٦٣دا هێرشی (الحرس القومي)ییەکان بۆ سەر شارو گوندەکانی کوردستان دەستی پێکردو (لە ١٩٦٣/٦/١٣ رژێمی بەعس بەربووە گیانی خەڵکی کوردستان گوندەکانی ناوچەی کەندیناوەی سەر بەپارێزگای هەولێرو گوندەکانیان بەمزگەوت و قوتابخانەکانەوە سوتاندو وێران کرد، کۆمەڵێ خەڵك شەهیدکران، هاوکاتیش بەعسییەکان کەوتنە تەعریب کردنی ناوچەکە)[٦١]. لەدرێژەی ئەو شالاوەدا تەنها لە کەندیناوەدا لەکۆی ٧٢ گوندی ئەم ناوچەیە پتر لە ٣٢ گوندی سوتاو تالان و برۆکراو نزیکەی ٣٠٠ کەسیش گیراو پاشان ٢٥ گوندی ئەم ناوچەیە درایە خێڵە دواکەوتووەکانی عەرەبی شەمەرو لێی نیشتەجێکران، کە تا ساڵی ١٩٦٧ی خایاند[٦٢]. ئەم هێرشانە شەڕی بەعسییەکان بووە دژ بە نەتەوەی کورد[٦٣]. بێگومان ئەم شەڕەیش بۆ قڕکردنی تەواوەتی کورد بووە. (لەشوباتی ١٩٦٣ وەو دواتر لەتەموزی ١٩٦٨وە تا ئیمڕۆ ئەو سیاسەتی لەناوبردن و ئیلغای بوونی نەتەوایەتی و بوونی کوردیان گرتۆتە بەر)[٦٤]. ئەو ساڵە بۆ کورد یەکێکە لەساڵە شوومەکان و هەر لەو ساڵەدا (بۆ یەکەمین جار لەعێراقدا بە بەرنامەو ڕێوشوێن

---

٥٩- هەمان سەرچاوە. . .

٦٠- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی . . . ل٢٢٢.

٦١- د.مارف عومەر گوڵ، سەرچاوەی پێشوو. . . ل٢٤.

٦٢- کاوە نادر، کەندیناوە لەنێوان راگواستن و بەعەرەبکردندا. . . ل٣٩.

٦٣- جواد ملا، کردستان والکرد وطن مقسم وامة بلا دولة. . . ص٨٩.

٦٤- ئازاد مستەفا، کوردو دوژمنەکانی، گۆڤاری پەیڤی نوێ، ژمارە ٢- خولی دووەم- بەهاری ١٩٩٢. . . ل٩٣.

کەوتنــە جێبــەجێ کردنــی پیلانــی سیاســەتی کــورد بــەعارەب کــردن و "تهجــیر"و "تبعیــث")[٦٥]. هــەر لەســاڵی ١٩٦٣دا گونــد ســوتاندنی کوردســتان دەســتی پێکــرد، ١٩٦٣/٤/٦ (شــێخ حەنــەش)[٦٦] بەگونــدەکانی بنــاری قەرەچــووغ داهــات و لەگونــدی دارەخورمــاوە دەســتی پێکــردو ســوتاندی. دواتــر گونــدەکانی (خدرجیجــە، لاوەر، کەندارە قەل، گێسمە، جاستان، دەربەند، سەربە شاخ) لەبناری قەرچووغ و کەندێناوە سوتێنران.

رژێمی عێراق لەلایەکی ترەوە هەوڵی دەدا ئێزدییەکانی کوردستان بکاتە عەرەب، بۆ ئەم مەبەستە لە ١٩٦٣دا (مکتب الاموي) بۆ بایزیدی برای معاویە بۆ بەعەرەبکردنی برا یەزیدییەکان کردەوە. هەروەها لە ١٩٦٣ و ١٩٦٤دا رژێمی عێراق (١١) گوندی لەسەر سنووری سوریا لەچوارچێوەی سنووری جوگرافی شنگاڵ راگواست دواتر ١٣٢ گوندی کوردانی راگواست و لە (١١) کۆمەڵگای زۆرەملێدا نیشتەجێی کردن و درێژەشی دایە تەواوکردنی (مستوطنات)ە عەرەبییەکان کە تا ساڵی ١٩٦٥ (٤٠٠) (مستوطنات)ی بۆ عەرەبان لەنێوان شنگاڵ و حەزەردا دروستکرد.

وەك لەپێشەوە ئامارەمان پێدا هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرێبەرایەتی بارزانی نەمر، گورزی باشی لەرژێم دەوەشاندو جەماوەریش لەلایەکی ترەوە دەسەڵاتی رژێمی هەراسان کردبوو، ئەمانە وایانکرد رژێمی عێراق وەك تاکتیکێك و بۆ خۆگرتنەوەی لە ١٩٦٤/٢/١٠ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان کەوتە گفتوگۆوەو ئاگر بەستی راگەیاند[٦٧]، بێگومان ئەو ئاگر بەستەشی پاش ئەوە هات کە بۆی روونبۆوە ناتوانێت وا بەئاسانی نەتەوەی کورد لەناوببات. ئەوەبوو دوای ئەوەی خۆی رێکخستەوە لە ١٩٦٥/٤/٤ دووبارە دەستی بەهێرش و پەلامار کردووە[٦٨] ئەمجارەیان لەجاران زۆر خراپتر کەوتە پەلاماردان و سوتاندنی گوندو شارو شارۆچکەکانی کوردستان و بۆ بەرگرتن لەم سیاسەت و پەلامارو گوند سووتاندنە

---

٦٥- هەمان سەرچاوە.

٦٦- شێخ حەنەش الحمود: شێخێکی عەرەب بوو، لەعەشیرەتی تەی و سەرەك جاشی عەرەبان بوو، زۆر دژی کورد بوو، پاشان لە ١٣/٤/١٩٦٨ لەگەڵ چەند چەکدارێکیدا لەلایەن هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کوژران.

٦٧- جواد ملا، کردستان والکرد وطن مقسم وامة بلا دولة... ص٨٩.

٦٨- هەمان سەرچاوە...

بارزانی ئەمر هەوڵیدا فشارێکی نێودەوڵەتی لەسەر رژێمی عێراق دروست بکات ئەوە بوو (لە ١٩٦٦/١/١دا بیر خەرەوەیەکی دایە نەتەوە یەکگرتووەکان. لەوەدا سیاسەتی "خاکی سوتێنراو"ی لەقاودا. لەگەڵ سەر ژمێرێکدا ئاشکرا کرا کە سەرجەم ١٨٦ گوند تەخت کراون. بارزانی داوای لەنەتەوە یەکگرتووەکان کرد لیژنەیەك بنێرنە نێوچەکانی شەڕ، تا بەچاوی خۆیان ئەو رەفتارە نامرۆڤانە باوەڕ نەکراوانە ببینن)[٦٩]. لەگەڵ ئەوەشدا هێزی پێشمەرگەی کوردستان دلێرانە بەرگری لەخاکی کوردستان دەکردو (لە ٢ و ١٩٦٦/١/٣دا سوپای عێراق لەپێنچوین خراپ شکێنرا)[٧٠]. سوپای عێراق رووی لەهەر شوێنێکی کوردستان بکردابووایە لای ئەو جیاوازی نەبوو بۆ تالآن و کوشتن و وێرانکردن (سەربازەکانی عێراق لە ١٩٦٦/٥/٢٥دا لەبێتوین حەفتاو سێ کوردیان کوشت "کە زۆربەیان ژن بوون")[٧١] سوپای عێراق سوپای تالآن و کوشتن و بڕین و وێران کردنە، بۆیە رووی لەهەر شوێنێك کردبێت تالآنی کردووەو خەڵکەکەی کوشتووەو شوێنەکەشی وێران کردووە. دوای ئەوەی سوپای عێراق لەداستانی بەناوبانگی شەڕی هەندرێن زۆر بەخراپی شکاو لەقەوچەی درایەوە، زانی کە بەئاگرو ئاسن ناتوانێ کورد لەناوببات لە ١٩٦٦/٦/٢٩ بەیانێکی بلأوکردەوەو رایگەیاند کە چارەسەری کێشەی کورد دەکات[٧٢]. لەرێی ئەم تاکتیکەیەوە جارێکی تر کەوتە فرت و فێڵ و دووبەرەکی نانەوە، کە لەئەنجامدا دەستەی جەلال تاڵەبانی بەلای خۆیدا راکێشاو کەوتە هاوکارییان بۆ دژایەتی کردنی شۆڕشی کوردستان. ساڵێك پاش بەیانەکە حکومەتی عێراق (لە ١٩٦٧/٦/٢٩ وەزارەتێکی بەنێوی "وەزارەتی کاروباری ژووروو"ەوە دامەزراند، کە ئەرکی "ئاوەدانکردنەوەی نێوچەکە" بێت)[٧٣]. واتە ئاوەدانکردنەوەی ئەو شوێنانەی کە خۆیان وێرانیان کردبوو، کە بێگومان بەهیچ شێوەیەك ئەمەیان نەکردو ناشی کەن، لەبەر ئەوەی حکومەتێك بەدرێژایی مێژووی دامەزراندنییەوە

---

٦٩- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . . ل٢٥٤.

٧٠- هەمان سەرچاوە. . . ل٢٥٥.

٧١- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . . ٢٦٧.

٧٢- جواد ملا، کردستان والکرد وطن مقسم وامة بلا دولة. . . ص٩٠.

٧٣- جەمال نەبەز، هەمان سەرچاوە. . . ل٢٨٠.

کاری تێکدان بێت، زۆر زەحمەتە فێرە ئاوەدانکردنەوە بێت، ئەوەتا پاشتر تا ساڵی ١٩٦٨ بەردەوام عەرەب هێنرا کەرکوك و دەوروبەری و، زیاتر لە ٢٢٠ گوندی لەناوچەی دوبز و ٢٥ گوندی لەناوچەی قەراج بەعەرەبکردو لەناوچەی شوان و شێخ بزێنیش هەمان سیاسەتی عەرەبنشین کردنی پەیڕەو کرد(٧٤).

لە ١٩٦٨/٧/١٧ بەعسییەکان هەستان بەکودەتایەکی تر و جڵەوی دەسەڵاتیان بەتەواوی گرتە دەست و، لەبەر ئەوەی تازە هاتبوونە سەر حوکم و بۆ سەرخستنی زیاتری کودەتایەکەیان لەگەڵ کورددا کەوتنە گفتوگۆ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێنەیی کاریان بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان دەکرد، هەوڵیاندەدا ئەو شارانەی کە لەرووی نەوت و کشتوکاڵەوە دەوڵەمەندن رێژەی کوردی تێدا کەم بکەنەوە، بۆ ئەم کارەش پەنایان دەبردە بەر دابڕینی ئەو ناوچانەی کە پیلانی بەعەرەبکردن تیایاندا بە تەواوی جێبەجێ نەکرابوو، زۆرینەی دانیشتوانی هەر بەکورد مابوون، وەك ئەوەی کەچەند ناوچەیەکیان لەپارێزگای موسڵ و پارێزگای کەرکوك دابڕی. پێش ئەوانیش هەر لە ١٩٦٨دا ئەو گوندانەی کەنزیکی کەرکوك بەتایبەت بیرە نەوتەکان بوون کە ١٣ گوند بوون تێکدران، لەوانەش گوندی (سۆنە گوڵی، یاروەلی، هەنجیرە، قوتان، قوشقایە، شوراو، باجوان)، هەروەها گوندەکانی دەوروبەری ناحیەی (دوبز)یش هەر لەو ساڵەدا راگوێزران و هۆزی عەرەبی بەدویان هێنرا شوێن کە (عواس صدید) سەرپەرشتی دەکردن(٧٥).

وەك باسمان کرد حیزبی بەعس کە جارێکی تر تازە لە ١٩٦٨/٧/١٧ لەرێی کودەتاوە هاتبۆوە سەر حوکم، سەرەتا بەشێنەیی و لەسەرەخۆ دەستی بە بەعەرەبکردن کردەوە، بۆ ئەوەی تاوانەکانی ١٩٦٣ جارێکی تر بەبیر خەڵکەکە نەهێنێتەوە، بەعس بەم شێوەیە بەردەوام بوو لەکاری خۆی تا ١٩٧٠/٣/١١ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان بەرێبەرایەتی بارزانی نەمر رێککەوت و رێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ یان راگەیاند، رێککەوتننامەکەش تا ساڵی ١٩٧٤ بەردەوام بوو، دواتر بەهۆی پاشگەزبوونەوەی بەعس لەرێککەوتننامەکەو

---

٧٤- کاوە نادر، کۆلۆنیالیزمی عێراقی و راگواستن و بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان، گۆڤاری سەرخۆبوون ژمارە ٧و٨ . . . ل٣.

٧٥- الدكتور نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي. . . ص٥٦-٥٧.

یەکلایی نەکردنەوەی پرسی سنووری کوردستان و شاری کەرکوك، جارێکی تر شەڕ لەنێوان عێراق و کورد بەرپا بۆوە. ئەم ڕێکەوتنەی بەعس لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش وەك تاکتیکێك بوو بۆ خۆ بەهێزکردن و خۆ پڕ چەك کردن بوو، بەدرێژایی ئەو چوار ساڵە هێزەکانی باش ئامادەو پڕ چەك کرد، لەماوەی ئەم چوار ساڵەشدا بەردەوام لەبیانووی هەڵگیرساندنەوەی شەڕ دەگەڕا. سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان بەردەوام جەختی دەکردەوە سەر ئەو ناوچە کوردییانەی کە عێراق لەخاکی کوردستانی دابڕی بوون و بەعەرەبی کردبوون و ئامادە نەبوو بیانخاتەوە سەر سنووری جوگرافی کوردستان، وەك شاری کەرکوك و شنگال و خانەقین و مەندەلی و...، کە ئەو شارانەش هەر هەموویان موڵکی کوردن و بەشێکن لەخاکی کوردستان، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان زۆر ڕاشکاوانە بەحکومەتی عێراقی ڕاگەیاندووە: (بەهیچ شێوەیەك دەست لەکەرکوك و شنگال و خانەقین هەڵناگرین و مومکینیش نییە ئەمە قبوڵ بکەین)[٧٦]و، زۆر ڕاشکاوانەتر بەدەسەڵاتدارانی عێراقیان ڕاگەیاندووە، کە دەبێ ئەوە ڕابگەیەنرێ کە ئەو ناوچانە بەشێکن لەکوردستان[٧٧]. بۆ دواجاریش کە شاندی کوردی لەبەغدا دەگەڕێتەوەو دەچێتە لای ڕێبەری شۆڕش (بارزانی نەمر)و بیروڕای حکومەتی عێراقی پێ ڕادەگەیەنن جەنابیشیان دەفەرمووێت: (خوا شاهیدە کە ئەز حەز لەشەڕ ناکەم. لەبەر ئەوەی شەڕ خراپترین ڕێگا چارەیە، بەڵام بەعس ڕێگایەکی دیکەی بۆ نەهێشتینەوەو، پێشنیارەکەیان هیچ مانایەکی دیکەی نییە، بێجگە لەوازهێنان لەکەرکوك و ناوچەکانی دیکە بۆ ئەوان، کە ئەمەش مەحاڵە. کەواتە باپێشوازی لەچارەنووسی خۆمان بکەین ئەگەر قەدەریشمان وابێت کە هەموومانی تێدا بچین، لەبەر ئەوەی حەز ناکەم کورد تف لەگۆڕەکەم بکەن و بڵێن "بۆچی کەرکوکت فرۆشت")[٧٨].

بەم شێوەیە سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان ئامادە نەبووە دەستبەرداری بستە خاکێکی کوردستان بێت و بەگیان و ماڵ بەرەڤانی لەخاکی خۆی کردووەو لەهەموو ڕێککەوتننامەیەکیشیدا لەگەڵ حکومەتی عێراق هەوڵیداوە ئەوە بچەسپێنێ کە دەبێ

---

٧٦- مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، الجزء الثالث. . . ص٢٩٦.

٧٧- هەمان سەرچاوە. . .

٧٨- هەمان سەرچاوە. . . ص٢٩٧.

ئـەو ناوچـانەی کوردسـتان بخرێنـەوە سـەر خـاکی کوردسـتان و ئـەو عەرەبانـەی هێنراونەتە سەر گوندەکانی کوردان بگێڕدرێنەوە شوێنی خۆیان, زۆر بەروونیش ئەم پرسـە لـەخاڵی (٨) هەشـتەمی رێککەوتننامـەی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠دا هـاتووە, کـە دانیشتوانی کوردو عەرەب بگەڕێنەوە سەر گوندەکانی پێشووی خۆیان[٧٩] کە ئەم خاڵەو خاڵەکانی تری رێککەوتننامەکە (کە لەو بابەتەن) لەلایەن حکومەتی عێراقەوە جێبەجێ نەکران.

لێرەدا زۆر بەروونی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بارزانی نەمرو سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان نەك هەر بۆ وەستاندنی سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان بەڵکو بۆ سڕینەوەی شوێنەوارەکانی بەعەرەبکردنی کوردستانیش کاریان کردووە.

---

٧٩- سعد البزاز، الاكراد في المسألة العراقية، . . . ص١٤٩.

# قۆناغی سێیەم

## ١٩٧٤- ١٩٩٠ سەردەمی بەعس

لەم قۆناغەدا, رژێمی بەعس بەدڕندانە ترین شێوە کەوتە بەردەوام کردنی پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان و, ئەو پیلانەی زیاتر بەرنامە ڕێژکردو بەپێی سیاسەتی فاشییانەی خۆی کەوتە سوتماك کردنی خاکی کوردستان و قڕکردنی نەتەوەی کورد, دوای ئەوەی کە لەڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ پاش گەزبۆوە, هێرشی کردەوە سەر شارو گوندەکانی کوردستان و کەوتەوە سوتاندنی تەڕو وشکی کوردستان و دەستی لەهیچ شتێك نەپاراست, بەمەشەوە نەوەستاو کەوتە پیلانگێڕان لەدژی شۆڕشی کوردستان و ئەوەبوو لەپیلانێکی هەرێمیو نێودەوڵەتیدا لە ١٩٧٥دا ڕێککەوتننامەی شومی جەزائیری لەگەڵ ئێران مۆرکرد, هەردوو رژێمی داگیرکەری کوردستان (عێراق و ئێران) ئابلوقەیەکی توندیان خستە سەر شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشیان تووشی نسکۆ کرد. دوای ئەوە لە ١٩٧٥دا عێراق دەستی کرد بەتێکدان و ڕاگواستنی سەدان گوندی کوردان بەناوی گوندە سنوورییەکان لەپارێزگای (هەولێر, سلێمانی دیالە, کوت, موسڵ, دهۆك)و بەدەیان گوندیش کە چاڵە نەوتییان تێدابوو لەدەوروبەری کەرکوك و مەخموور و خانەقین و شنگاڵ و کەندێناوە ڕاگوێزران و پاشان عەرەبنشین کران, هەر لەو ساڵەدا (ڕژێم دەستیکرد بەگرتن و ڕاگواستنی ژمارەیەکی زۆری کوردە فەیلییەکان بۆ ئێران بەو پێیەی کە ئەوانە تەبەعییەی ئێرانن)[٨٠]. هەر لە ١٩٧٥دا حکومەتی عێراق دەستی دایە پەلاماردانێکی ڕاماڵین و (بەعەرەبکردنی) ئەو ناوچانەی کە بەپێی سنووری ئیداری (ناوچەی ئۆتۆنۆمی کارتۆنی) لەکوردستان وەدەر نرابوون[٨١]. هەر لەو ساڵەدا بەپێی فەرمانێکی کۆماری (مرسوم جمهوری) چەند گوندێك لەکەندێناوە خاپوور کران وەك (جاستان, دەربەندی گۆم, سەر بەشاخ, پەلکانە, عەولا فات, دەربەندی سارەلوو..). لەپرۆژەی بەنداوی سەددام (سد صدام) ٦٠ گوند خرایە ژێر ئاوەوە, ئەوەش زیاتر بۆ لێکدا بڕینی جەزیرەو موسڵ بوو, پاشان گوندەکانی دەوروبەری تەلەعفەری ڕاگوێزران هەر لەو

---

٨٠-د.کازم حبیب، مەینەتی کوردە فەیلییەکانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە ٢٥- پاییزی ٢٠٠٢ . . . ل١١٢.

٨١- میدل ئیست ووچ، جینۆساید لەعێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد. . . ل٩٩.

ساڵەدا (١٩٧٥) رژێم ٣٨ گوندی لەدەڤەری شێخان بەعەرەبكردو زەویو زاری ئەو گوندانەشی دا بەخێزانەكانی عەشیرەتی (الحديد) و لهێب[٨٢].

هەر لە ١٩٧٥دا (٦) گەڕەك لەناو شنگاڵ هاتنە خراكردن (برج، كەلا، بەرسی، بەربەرۆژ، كۆرا ستی، سەرا)و دەستكرا بەگۆڕینی ناوی گوندەكانی دەوروبەری شنگاڵ بۆ نموونە:

| ز | ناوی كوردی | ناوی عەرەبی |
|---|---|---|
| ١- | گوه بەل | الاندلس |
| ٢- | زۆراڤا | العروبه |
| ٣- | دووگور | حطين |
| ٤- | خانه سۆر | التأميم |
| ٥- | دهۆلا | القادسية |
| ٦- | گرزەرك | عدنانية |
| | | تد. |

لەساڵی ١٩٧٦دا رژێمی بەعس درێژەی بەسیاسەتە گلاوەكەی داو (قۆناغی لەقاڵبدانی كوردو تەسك كردنەوەی (حد الممكن)ی كوردستان، بەرنامەی ئەم قۆناغە لەساڵی (١٩٧٦)ەوە بەجدی دەستی پێكردووە)[٨٣] و رژێمی عێراق پێنج ساڵی دانابوو بۆ تەواوكردنی ئەم بەرنامەیەی واتە لە (١٩٧٦- ١٩٨١) بەرنامەكەشی بریتی بوو لەتێكدان و راگواستنی گوندەكانی كوردستان، لەسەرەتادا بەناوچە نەوتییەكان و ستراتیژییەكانی وەك ناوچەكانی كەركوك و خانەقین و مەندەلیو مەخموورو شنگاڵ و زەمار دەستی پێكرد، رژێمی عێراق پاش ئەوەی كوردی گوندەكانی رادەگواست، پاشان بەبیانووی پاراستنی بیرە نەوتەكان گوندەكانی عەرەبنشین دەكرد، هەر لەو ساڵەدا بەپێی فەرمانی كۆماری ژمارە ٤١ لە

---

٨٢- ابو رۆژ، نبذة تأريخية حول قصبة عين سفني- الشيخان، مجلة لالش، العدد ١٢- كانون الثاني ٢٠٠٠، ص١٤٠.

٨٣- ئازاد مستەفا، كوردو دوژمنەكانی، گۆڤاری پەیڤی نوێ. . ل٩٧.

١٩٧٦/١١/٢٩ ناوی پارێزگای کەرکوکی لەکەرکوکەوە گۆڕیو کردی بە پارێزگای (التأميم)و بەپێی هەمان فەرمان قەزای دووزیشی خستە سەر پارێزگای سەلاحەددین کە هەر بەو فەرمانە ئەو پارێزگایەش پێکهاتبوو[٨٤]. هەر لەو ساڵەدا گوندی سەرگەڕان لەدیبەگە دابڕاو خرایە سەر قەزای دوبزو کرا بەناحیەی قودس (ناحية القدس)و پاشتر سەر بەشاخ و ٢٩ گوندی تر خرانە سەر ناحیەی سەرگەڕان، هەر لەو ساڵەدا گوندی پەلکانەو ٢٦ گوندی تر لەدیبەگە کرانەوەو خرانە سەر کەرکوك و درانە خێزانە کۆچەرەکانی عەشیرەتی شەمەر کە (شێخ نایف) ناوێك سەرپەرشتی دەکردن. هەر لەو ساڵەدا خێزانێکی زۆری لەعەشیرەتی جبور هێنا دەشتی کەندێناوەو ئەو گوندانەی پێبەخشین (جاستان، دەربەند، سەر بەشاخ، پەرکانە، عەوڵلا فات، سارەلوو، شەنەعە، دڕکەی گەورە، دڕکەی گچکە، چەرت، گێسمە، گەزوەشان، گڕاو، تەل هەلالە)و عەرەبەکانیش لەسەر زەوییو زاری ئەو گوندانە دانیشتن.

لەساڵی ١٩٧٧دا، رژێمی عێراق کەوتە تێکدانی گوندو شارۆچکە سنوورییەکان (لەساڵی ١٩٧٧وە کەوتە چۆڵکردن و وێران کردنی سەرپاکی گوندو شارۆچکەو شارە سەر سنوورییەکانی نێوان کیانی سیاسی (عێراق- سوریا)، (عێراق- تورکیا)و (عێراق- ئێران)و بەقوڵی ٥- ٢٠کم و کۆکردنەوەو بەندکردنی خەڵکەکەی لەچەند ئۆردوگایەکی گەمارۆدراوی بن دەستی خۆیان و کەوتنە تێکدان و شێواندنی تەبع و تەبیعەت و ئاکارو رەوشت و کولتوورو هەرچی رەسەنایەتی کوردێتی هەیە تیایان دا)[٨٥]. هەر لەو ساڵەدا هێرشێکی لەدژی ئاشوورییەکان دەستپێکردو لەدەڤەری بادینان ١٢ دوانزە کەنیسەی لێ رووخاندن[٨٦] بەمەشەوە نەوەستاو لەسەر ژمێری ١٩٧٧دا ئێزدییو شەبەك و ئاشوورییەکانی بەعەرەب ناو نووس کرد[٨٧] ئەمەش هەر بۆ ئەوە بوو تاوای بەدەربخات کە رێژەی دانیشتوانی عەرەب

---

٨٤- وريا الجاف، كركوك دراسة سياسية واجتماعية. . . ص١٥٦.

٨٥- ئازاد مستەفا، کوردو دوژمنەکانی، گۆڤاری پەیڤی نوێ. . . ل٩٧-٩٨.

٨٦- میدل ئیست ووچ، جینۆساید لەعێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد. . . ل٥١٦.

٨٧- جەزا تۆفیق تالب، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوانی لەکوردستاندا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە ٢- ساڵی حەوتەمی- مایسی ١٩٩٩. . . ل٩.

لەناوچەکانی کوردستاندا زۆرە. لەبەر ئەوەش بوو کە سەرەنجامەکانی سەر ژمێری ساڵی ١٩٧٧ی عێراق، بەشێوەیەکی بەرچاو ئاماژەیان بۆ کەم بوونەوەی رێژەی دانیشتوانی کورد لەپارێزگاکانی کوردستان کردووە[٨٨].

ساڵی ١٩٧٨ شاڵاوێکی تری گوند تێکدانی دەست پێکرد، کەزیاتر گوندە سنوورییەکانی گرتەوە، دەتوانین بڵێین تەواوکردنی شاڵاوەکەی ساڵی ١٩٧٥ی بوو، ئەو گوندانەی کە مابوون هەمووی کاولکردن و خەڵکەکەشی هێنا لەچەند ئۆردوگایەکی زۆرەملێی پەستا، لەلایەن رژێمی عێراق بەو ئۆردوگایانە دەوترا (گوندی هاوچەرخ).

ناوچەکانی بەهۆی سنوورەوە راگوێزران ئەمانە بوون، لەپارێزگای سلێمانی گوندەکانی نزیك هەڵەبجە، پێنجوین، شارباژێر، پشدەر، کە ژمارەی ئەو گوندانەی تێکدران گەیشتە ٥١٧ گوندو خەڵکە راگوێزراوەکەش ١٨٥٩٩ کەس بوون، لەپارێزگای هەولێردا ١٤٨ گوند لەسنووری قەزاکانی (چۆمان، رواندوز، زێبار) تێکدران و خەڵکە راگوێزراوەکەشی کە تەنها هی ١٣٢ گوند زانراوە ٤٣٨٧ کەس بوون، هەروەها لەپارێزگای دهۆکیشدا ٢٠٧ گوند لەسنووری قەزای ئامێدیو زاخۆ تێکدران و خەڵکە راگوێزراوەکەش ژمارەیان ٧٨٢٨ کەس بوون، واتە سەرجەمیان دەکاتە ٨٧٢ گوندو خەڵکە راگوێزراوەکەش دەکاتە ٣٠٨١٤ کەس، سەرجەم ئەو خەڵکانە لە ٢٩ ئۆردوگای زەملێ لەپارێزگای سلێمانیو ١٦ ئۆردوگا لەپارێزگای هەولێرو ١٤ ئۆردوگا لەپارێزگای دهۆك گەماپۆدران[٨٩] بەم شێوەیە رژێمی داگیرکەری عێراق گوندەکانی سەرسنووری خاپوور کردو خەڵکەکەشی راگواست، (بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە دوورە دەستیان بۆ لەبن دەستی خۆیاندا کۆوە بێت و ئامادەیان کەن بۆ بەرنامەی قۆناغی دووەمی لەناو بردن)[٩٠]. ئەمەش مەبەستی سەرەکییان بووە.

---

٨٨- د.خەلیل ئیسماعیل محەمەد، کورد لەسەرژمێرە رەسمییەکانی عێراقدا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢- ساڵی شەشەم- مایسی ١٩٩٨. . . ل٩.

٨٩- چیا، راگواستنی ناوچە سنوریەکانی کوردستان، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژمارە ٢- ساڵی دووەم تەمووزی ١٩٩٣. . . ل١١-١٢-١٣.

٩٠- ئازاد مستەفا، کوردو دوژمنەکانی، گۆڤاری پەیفی نوێ. . . ل٩٨.

رژێمی داگیرکەری عێراق؛ لەساڵی ١٩٧٩دا بۆ زیاتر بەعەرەبکردنی کوردستان، سیاسەتێکی تری گرتە بەر ئەویش دروستکردنی (مستوطنات) بوو بۆ عەرەبەکان، خۆی ئەو (مستوطنات)انەی دروستدەکردو هەموو هۆیەکانی خزمەتگوزاریشی بۆ دەبردن، ئنجا عەرەبی دەهێنا ناویان. (ساڵی ١٩٧٩ لەلای کەرکوکی نوێ "کرکوك الجدیدة"، کە دەکەوێتە رۆژئاوای شار رژێم دەستی بە پرۆژەی دروستکردنی ٢٠٠٠ تا ٤٠٠٠ خانوو کرد)[٩١]. لەناوچەی (عەرەفە)ش ١٠٠٠ خانووی بۆ کرێکارە عەرەبەکانی کارگەی غازو کبریت و پاڵاوگەی نەوت دروستکرد[٩٢]، ئەو کرێکارە عەرەبانەشی هێنابووە شوێنی ئەو کرێکارە کوردانەی کە پێشووتر هەموویانی گواستبۆوە بۆ فەرمانگەی تر لەپارێزگاکانی عێراق، ٨٠٠ خانووی لە (تسعینی کۆن)و ١٢٠٠ خانووشی لەسەر رێگای بەغداو ١٦٠٠ خانووش بەناوی (حي غرناطة) دروستکران، ئەمانە هەموویان لەناو شاری کەرکوك ئەنجامدران، جگە لەمانە ١٠٠٠ خانوو لەسەر رێگای لەیلان و ١٥٠٠ خانوو بەناوی (حي العروبة)و ٣٠٠ خانوو بەناوی (حي الوحدة)و ٢٢٠ خانوو بەناوی (دور الأمن)و ١٠٠ خانوو بەناوی (دور ضباط الصف)و ٧٥٠ خانوو بەناوی (حي قتیبیة)و هەروەها لەگەڕەکی ئیمام قاسمدا ٢٠٠ پارچە زەوی دابەشی سەر ئەو عەرەبانە کرد کە بۆ کەرکوکی هێنابوون[٩٣]

هەر لەو ساڵەدا ژمارەیەکی زۆری خانووی لەمەخموور بۆ عەرەبە هێنراوەکان دروست کردو هاوکاری دەکردن کە بێنە سەر زەوی‌و زاری کوردان و ناو شاری مەخموور.

ساڵی ١٩٨٠" رژێمی فاشی عێراق جارێکی تر کەوتەوە پیلانگێران بۆ راگواستن و دەربەدەر کردنی کوردو، ئەمجارەشیان بایداوە سەر فەیلییەکان و بەپێی بڕیاری ١٨٠ی ساڵی ١٩٨٠ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) کە کۆمەڵێ رێ‌و شوێنی توندی تێدابوو بۆ پێدانی رەگەزنامەی عێراقی‌و لەمەشدا برا فەیلییەکان بێبەش دەکران، کە هەر واش دەرچوو، رۆژی ٧/٤/١٩٨٠ لەیادی ترەکینی حزبی بەعس دا دەزگا داپلۆسێنەرەکانی رژێم لەکاتی کۆکردنەوەی ٤٨٠ بازرگانی عێراق، هەموو بازرگانە کوردە فەیلییەکانیان گرت و راپێچی زیندانەکانیان کردن و دەستیان

---

٩١- وریا الجاف، کرکوك دراسة سیاسیة واجتماعیة. . . ص١٤٠.

٩٢- هەمان سەرچاوە. . .

٩٣- هەمان سەرچاوە. . . ص١٤١.

بەسەر هەموو سەروەت و سامانیان داگرت و ژمارەیەکی زۆریشیان لەسەر سنووری ئێران فرێدران و ناچار کران روو لەئاوارەیی و ژیانی پڕ لەکولەمەرگی و چەرمەسەری بکەن و پەنابەرنە بەر ئێران[٩٤]. پاش ئەوەش هەر بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بڕیارێکی تری بەژمارە (٦٦٦) دژ بەفەیلییەکان دەرکرد ( دەرچوونی بڕیاری "٦٦٦"یش لە ١٩٨٠/٥/٧ گورزێکی بنچینەیی بوو کە ئاراستەی کوردە فەیلییەکان و ژمارەیەکی زۆری عەرەبە عێراقییەکانی ناوچەکانی ناوەڕاست و باشوورو هەندێك شاری کوردستانیش کرا کە کوردە فەیلییەکان تیادا دەژیان)[٩٥].

بەپێی ئەو بڕیارە رەگەزنامەی عێراقی لەژمارەیەکی زۆری فەیلییەکان سەنرایەوەو دەربەدەرکران. مەبەست لەمەش کەمکردنەوەی رێژەی کوردو لەناوبردنی بوو. بەم شێوەیە رژێمی داگیرکەری عێراق سالانەو بەردەوام هەولیدەدا پیلانەکانی لەبارەی بەعەرەبکردنی کوردستان ئەنجامبدات، ئەو شالاوانەی عێراق بەردەوام بوو تا هەلگیرساندنی شەڕ لەدژی ئێران لە ١٩٨٠/٩/٢٢دا.

رژێمی داگیرکەری عێراق سەرەڕای بەردەوام بوونی شەڕی ٨ سالەی لەگەل رژێمی داگیرکەری ئێراندا، بەردەوام و سالانە بەرنامەی بەعەرەبکردنی کوردستانی درێژە پێدەدا، راگواستن و دەربەدەرکردنی کوردو دەستبەسەر داگرتنی زەوی و زاری کوردان لەلایەن رژێمەوە بەپێی بڕیاری رەسمی ئەنجام دەدران، بۆ نموونە دەستی بەسەر زەوی و زارێکی زۆری کوردان لەخانەقین دا گرت و بڕیاریشی پێدەرکرد، بەپێی بڕیاری ژمارە ٤٨٩ لە ١٩٨١/٤/١١ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) دەستی بەسەر زەوی و زاری جوتیارانی خانەقین داگرت بەبیانووی کرینەوەی زەوییەکان[٩٦]، زەوییەکانیش هەمووی هی جوتیارانی کوردو ئەوانەی پێشووتر راگوێزرابوون بوو، پاشتر زەوییەکانی دا خێلە کۆچەرەکانی عەرەب و عەرەبنشینی کردن و، لەسالی ١٩٨٢دا گوندی حاجی شێخان و لاوەری خاپوور کرد، هەر بەمەبەستی خاپوور کردن و وێرانکردنی گوندو رەزوو باخی جوتیارانی کورد لەسالی ١٩٨٣دا حکومەتی عێراق رێککەوتنێکی لەگەل رژێمی داگیرکەری تورکیادا مۆرکردو

---

٩٤- مەلا شاخی، ئەنفالی خالخالان. . . ل٣.

٩٥- د.کازم حەبیب، مەینەتی کوردە فەیلییەکانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی. . . ل١١٣.

٩٦- رۆژنامەی الوقائع العراقیة، ژمارە ٢٨٢٩- رۆژی ١١/٥/١٩٨٠.

بەپێی ڕێککەوتننامەکە هەر یەکەیان بۆیان هەیە بەقوڵایی ١٧کم بچنە نێو خاکی یەکتری[٩٧] [٩٨]، بۆ ڕاوەدوونانی شۆڕشگێڕانی کورد، هەر لەساڵی ١٩٨٣دا (٨) هەشت هەزار بارزانی بێ سەرو شوێن کرد، دواتر لەساڵی ١٩٨٤دا بەدواوە بەپێی بەرنامە دەستی بەراگواستنی کوردو هێنانی عەرەب بۆ شوێنیان کردو، ئەم بەرنامەیەی تاساڵی ١٩٩٠ درێژە پێدا. لەساڵی ١٩٨٥یشدا لەسنووری قەزای مەخموردا دەستی بەتێکدانی کۆمەڵێك گوند کرد لەوانە گوندی (مشار، وادی الغراب، کێلەشین، هەوار غەڵ، قەنەجەلعە، معێجیلە، گرون، پیرداود وسو، چەند گوندێکی تر). لەساڵی ١٩٨٥یشدا هەر بەمەبەستی کورد کوشتن، پەنای بردە بەر کارێکی بێ ڕەوشتانە لەدژی منداڵانی کوردو (لە ١٩٨٥/١/١٠ لەناوچەی ئامێدی فڕۆکەکانی ڕژێم بووکۆکەی یاری منداڵانیان "کە لوغم ڕێژ کرابوون" هەڵداو بەدەستی منداڵانەوە تەقینەوەو دوو منداڵ شەهید بوون)[٩٩].

هەر لەو ساڵەدا ڕژێم بۆ بێبەش کردنی منداڵانی کورد لەخوێندن کۆمەڵێ قوتابخانەی داخست کە ژمارەیان (٧٧٦) قوتابخانە بوو[١٠٠]. بەم شێوەیە لە دهۆك (٢٠٨) قوتابخانەو، لەهەولێر (٢٠٠) قوتابخانەو، لەکەرکوك و سلێمانی ٣٤٠ قوتابخانە. لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٦ەوە تاکۆتایی ئەو ساڵە زیاتر لە ١٨٩٥ گوندو شار بەر ڕاگواستن کەوتوون، کە ژمارەی ١٤٧٦ گوندیان دەکاتە ٨٤٨٧٧ خێزان[١٠١]. (سیاسەتی ویرانکردن و ڕاگواستنیش بووە هۆی ئەوەی تاکۆتایی ساڵی ١٩٨٦ زیاتر لە "٤٢،٤٨٨کم٢" واتە ٤٩،٤١٪ی خاکی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراق تەعریب بکرێ)[١٠٢]. لەساڵی ١٩٨٥ تا ساڵی ١٩٨٧ (١٤١) گوند لەسنووری قەزای مەخموور تەعریبکرا.

---

٩٧- سعد البزاز، الاكراد في المسألة العراقية، . . . ص٧٧.

٩٨- زەوی سەر سنووری وڵاتانی داگیرکەر (عێراق- ئێران)و (عێراق- تورکیا)و (عێراق- سوریا) هی کوردن بەڵام لەڕووی یاسای نێودەوڵەتییەوە بەخاکی ئەوان ناوی دەبرێت، ئەگەرنا هی ئەوان نین.

٩٩- د.عارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد، . . . ل٧٢.

١٠٠- هەمان سەرچاوە. .

١٠١- د.عارف عومەر گوڵ، سەرچاوەی پێشوو. . . ل٣٣.

١٠٢- هەمان سەرچاوە. . . ل٣٤.

پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان و قڕکردنی کورد لەساڵانی ١٩٨٧و ١٩٨٨دا گەیشتە لوتکە، کە جگە لەڕاگواستن و وێرانکردنی گوندەکان قڕکردنی خەڵکیش دەستی پێکردو، چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتیش لەدژی کورد بەکارهات، ئەوە بوو لەو ماوەیەدا زیاتر لە ٤٠ پەلاماری کیمیایی بۆ سەر زیاتر لە ٢٠٠ گوندو شوێن ئەنجامدرا. بەرپرسیاری راستەوخۆی ئەو هێرشانەش تاوانباری جەنگ (عەلی حەسەن مەجید)ی خوێنرێژ بوو، کە بەپێی بڕیاری ١٦٠ی ١٩٨٧/٣/٢٩ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) تەواوی دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری لەناوچەکانی کوردستان پێدرابوو.

لەهێرشە کیمیاییەکانی سوپای عێراق بۆ سەر هەڵەبجە لە ١٩٨٨/٣/١٦ (٥) هەزار کەس و لەهێرشە کیمیاییەکانی تریش بۆ سەر دۆڵی جافایەتیو گەرمیان و دۆڵی بالیسان و خۆشناوەتیو دەڤەری بادینان بەهەزاران کەس شەهید بوون، پێش عێراقیش رژێمی داگیرکەری تورکیا چەکی کیمیایی لەدژی کورد بەکارهێناوە (هەندێ سەرچاوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کەمالییەکان لەشەڕی دێرسیم ١٩٣٦-١٩٣٨ هەتا ماددەی کیمیاوی یان بەکارهێناوە)[١٠٣]. پێش ساڵی ١٩٨٨ رژێمی عێراق چەکی کیمیاوی لەدژی کورد بەکارهێناوە (١٩٨٧/٦/٨ بۆ ماوەی سەعاتێك بەچەکی کیمیاییو بەراجیمە گوندەکانی بەرگەڵوو و هەڵەدن و سێکانیان بۆردومان کرا)[١٠٤]. هەر لەساڵی ١٩٨٧دا شاڵاوی گوند رووخاندنی برا ئاشوورییەکانیش دەستییپێکردو ژمارەیەك گوندی ئاشوورییان تەخت کران وەك گوندی باختمێو دەوروبەری[١٠٥].

سوپای عێراق لەهێرش و پەلامارەکانی خۆیدا بۆ سەر گوندەکانی کوردستان لەساڵی ١٩٨٧دا بەلای کەمەوە ٧٠٣ گوندی کوردانی تێکداو لەسەر نەخشەی سڕینەوە[١٠٦]. بەم شێوەیە:

٢١٩ گوند لەهەولێر.

١٢٢ گوند لەکەرکوك و گەرمیان.

---

١٠٣- محەمەد سەلام، لۆزانی ١٩٢٣و لۆزانی ١٩٩٠. . . ل٣٩.

١٠٤- میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لەعێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد. . . ل١٩٢.

١٠٥- میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو. . . ل٥١٧.

١٠٦- هەمان سەرچاوە. . . ل١٦٠.

٣٢٠ گوند لەسلێمانی.

٥٠ گوند لەدهۆك.

بەتەنها لەسنووری قەزای مەخموور لە ١٩٨٥-١٩٨٧ رژێمی عێراق ١٤١ گوندی خاپوور کردو پاشان عەرەبنشینی کردن. هەر لەو ساڵەدا بەناو (سەرکردایەتی نووسینگەی رێکخستنی باکووری حزبی بەعس) بڕیاری بەکۆمەڵ کوشتن و تاڵانکردنی کوردستانی داوەو، تاوانباری جەنگ عەلی حەسەن مەجید بڕیارێکی بەئیمزای خۆی بڵاوکردۆتەوەو جەخت دەکاتە سەر ئەو بابەتە، بڕیارەکەش بریتیە لەبڕیاری ژمارە ٤٠٠٨ی ١٩٨٧/٦/٢٠ی (نووسینگەی رێکخستنی باکووری حزبی بەعس)، کە لەخاڵی پێنجەمی ئەو بڕیارەدا هاتووە ئەوانەی لەگوندەکان دەگیرێن پاش لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا بەمەبەستی زانیاری وەرگرتن لێیان، ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان ١٥-٧٠ ساڵدایە دەبێ ئیعدام بکرێن (ئەم خاڵە پێی لەسەر داگیراوە)، لەخاڵی حەوتەمی ئەو بڕیارەشدا هاتووە ئەوەی لەگوندەکان هەیە دەستی بەسەر دابگیرێ و ببێتە موڵکی جاش و سوپا جگە لەچەك[١٠٧]، ئەمەش تاڵانی گوندەکان دەگەیەنێت. بۆ جێبەجێکردنی ئەم خاڵە سوپای رژێم هەر لەو ساڵەدا لە چەند شوێنێکی کوردستاندا بەبێ دادگایی کردن خەڵکی ئیعدام کرد وەك ئەوەی لە ١٩٨٧/١١/١١ نزیکەی (١٥٠) کەسیان لەگوندی چیمەن-ی سەر بەکەرکوك ٢٣ کەسیان لە شەقڵاوە لەهەمان مانگ و ساڵدا گوللە بارانکردو لە ١٩٨٧/١١/١٨یشدا (٣١) کەس لەئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەسێدارە دران و ٣٠٠ کەسیش لەسلێمانی بەهەمان شێوە قڕکران[١٠٨].

ساڵی ١٩٨٨ بەنسبەت کورد، یەکێکە لەساڵە شوومەکان و، دەتوانین بڵێین ساڵی وێرانکردنی کوردستان و لەناوبردنی کورد بووە لەلایەن رژێمی عێراقەوە، دڕندانەترین هێرش و پەلامارەکانی ئەو ساڵە بریتین لەشاڵاوە بەدناوەکانی ئەنفال کە لەئازاری ١٩٨٨ دەستی پێکردو لە ١٩٨٨/٩/٥ کۆتایی هات[١٠٩] رژێم لەدرێژەی ئەو شاڵاوانەیدا لەکۆی ٨٦٠٠٠کم٢ لەخاکی باشووری کوردستان ٤٢,٤٨٨کم٢ی

---

١٠٧- هەمان سەرچاوە. . . ل١٧٤-١٧٥.

١٠٨- هەژار عەزیز سورمێ، کوردو جینۆسایدو ئیبادەکردن. . . ل٤٢.

١٠٩- د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد. . . ل٣٨.

لێراگواست و بەعەرەبکرد، کە دەکاتە نزیکەی ٤٩,٤١٪ی سەرجەم خاکی باشووری کوردستان، رژێمی عێراق لەو ساڵەدا زیاتر لە ٤٥٠٠ گوندو شارو شارۆچکەی کوردستانی راگواست و ویرانکردو سووتاندو ٢٥٠٠٠٠ مرۆڤی کوردیشی بێ سەرو شوێن کردو لەناوبردو، زیاتر لە ٤٠ پەلاماری کیمیایی بۆ سەر زیاتر لە ٢٠٠ گوندو شوێن ئەنجامدا. لەشەوی ٢١-١٩٨٨/٨/٢٢ شارۆچکەی دیبەگەی سەر بەقەزای مەخمووری پارێزگای هەولێر بەتەواوی راگواست و کەسی تێدا نەهێشت، دواتر وردە وردە عەرەبی بۆ هێناو عەرەبنشینی کرد. بێگومان شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان ئەنجامدراون (مەبەستێکی تری رژێم لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا، تەعریب کردنی ناوچەکانی کوردستان بوو)[110]. ئەم شاڵاوانەی ئەنفال کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆ سەر کەمبوونەوەی رێژەی زیاد بوونی دانیشتوانی کوردستان (ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ ئەنفالە بەدناوەکان و دەرکردن و راگواستنی دانیشتوانی هەرێم "مەبەست باشووری کوردستانە.. غ.م" کە بوو بەهۆی کەم بوونەوەی قەوارەی دانیشتوانی هەرێم و دواتر کەم بوونەوەی رێژەی گەشەکردنی دانیشتوان)[111]. ئەو گوندو شارۆچکانەی کوردان کە لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا ویران کران، پاشتر زۆربەی هەرە زۆریان لەلایەن رژێمی عێراقەوە درانە عەرەب و عەرەبنشین کران، بەتایبەت گوندەکانی دەوروبەری کەرکوك و گەرمیان و دەشتی قەراج و دەشتی مەخموورو دەشتی کەندیناوەو دەوروبەری گوێرو بەشێك لەگوندەکانی دەشتی هەولێر. ئەوەش دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان بووەو، لەهەمان کاتدا بۆ وێرانکردن و تاڵانکردن و قڕکردنی کورد بووە. بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (١ تا ٧).

پاش شاڵاوەکانی ئەنفالیش رژێمی عێراق بەردەوام بوو لەسەر رووخاندن و راگواستنی شوێنی تر، ئەوەبوو لەساڵی ١٩٨٩دا شارۆچکەکانی قەلادزەو سەنگەسەرو پێنجوێن—ی راگواست و کاول کرد، رژێمی عێراق بەپێی بڕیاری ٢٦٣ی ١٩٨٩/٤/١٩ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) کۆمەڵێ ئۆردووگای زۆرەملێی لەپارێزگاکانی هەولێرو دهۆك و سلێمانی دروستکرد، بۆ چاوەدێری و کۆنترۆڵکردنی خەڵکە راگوێزراوەکان. هەر لەو ساڵەدا ١٤ گوندی برادۆستی راگواست

---

١١٠- یوسف دزەیی، ئەنفال کارەسات، ئەنجام و رەهەندەکانی.. ل٣٤.

١١١- جەزا تۆفیق تالب، بایەخی جیۆپۆلەتیکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق.. ل٤٢.

(لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٩دا بەفەرمانی ژمارە ٣٤٤٨ی نووسینگەی باکوور فەرمانی کرد بە "چوڵکردن و کۆکردنەوە"ی ژمارەیەکی دیاری نەکراو لەگوندەکانی هەردوو هۆزی برادۆست و دۆڵەمەریدا)[112]. بەدرێژایی ساڵی ١٩٨٨و ١٩٨٩ رژێم زۆرترین ژمارەی عەرەبی هێناوەتە کەرکوك و تێیدا نیشتەجێی کردوون سەیری بەڵگەنامەکانی ژمارە (٨ تا ١٧)و بەڵگەنامەکانی ژمارە (١٩ تا ٢٤)و (٢٦ تا (٥٤) بکە. ئەو عەرەبانەی کە بۆ کەرکوك دەهێنران دەبووا بەتەواوی دڵسۆزی رژێمی عێراق بووان و هیچ شتێکیان لەسەر نەبووا. سەیری بەڵگەنامەکانی ژمارە (١٨ و ٢٥) بکە.

لەساڵی ١٩٩٠دا رژێمی عێراق دەستی کرد بەتێکدان و لەناوبردنی ئەو کەپرو ساباتانەی جوتیارانی کورد کە لەهەندێ شوێن مابوون و هەمووی رووخاندن. دائیرەکانی ئەمنی رژێم ریێو شوێنی زۆر توندیان بەرامبەر جوتیارانی کورد گرتەبەرو رێگەی کشتوکاڵ کردنیان نەدەدا ئەگەر جوتیارەکە جێگەی متمانەیان نەباو نەشیان دەهێشت شەو بمێنێتەوەو کەپر دروست بکاتەوە. بەم شێوەیە رژێمی عێراق لەسەر بەعەرەبکردنی کوردستان بەردەوام بوو تا داگیرکردنی کوێت و دەستپێکردنی شەڕی دووەمی کەنداو.

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا رژێمی عێراق لەدوای ١٩٨٤ەوە تا ١٩٩٠ شالاّوێکی بەرفراوانی راگواستنی دەستپێکرد کە زیاتریش ناو شاری کەرکوکی گرتەوە، کە بەپێی ئامارێکی پارێزگای کەرکوك ژمارەی دەرکراوەکانی شاری کەرکوك و دەوروبەری لەپێش راپەرینی بەهاری ١٩٩١دا بە (١٨,٦٠٠) خێزان کە دەکاتە ١٢٣,٤٩٠ کەس مەزندە کراوە، کە بەم شێوەیەیە:

| ز | ساڵ | ژمارە خێزانی دەرکراو |
|---|---|---|
| ١- | ١٩٨٤ | ١٤٥٠ خێزان |
| ٢- | ١٩٨٥ | ١٧٠٠ خێزان |
| ٣- | ١٩٨٦ | ٢٠٥٠ خێزان |
| ٤- | ١٩٨٧ | ٣١٥٠ خێزان |
| ٥- | ١٩٨٨ | ٥٠٠٠ خێزان |

١١٢- میدڵ ئیست ۆچ، جینۆسایدلەعێراقدار پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد... ل٥٣٠.

| ٦- | ١٩٨٩ | ٢٩٥٠ خێزان |
|---|---|---|
| ٧- | ١٩٩٠ | ٢٣٠٠ خێزان |

لــەبارەی تێکــدان و روخانــدنی گونــدەکان و بەمەبەســتی بــەراورد کــردن و وەك نموونەیــەك بەپێویــستی دەزانــین کــە ژمــارەی گونــدەکان بــەپێی ســاڵەکان لەچــەند شوێنێکدا بخەینە روو:

| شوێن | ساڵ | ژمارەی گوند |
|---|---|---|
| سلێمانی | ١٩٧٧ | ١٨٧٧ گوند |
| | ١٩٨٧ | ١٨٦ گوند |

واتە نزیکەی ١٧٠٠ گوند تێکدراوەو لەسەر نەخشە سڕاوەتەوە[١١٢].

| شوێن | ساڵ | ژمارەی گوند |
|---|---|---|
| کەرکوك | ١٩٥٧ | ١٢٧٤ گوند |
| | ١٩٨٧ | ٥١٦ گوند |
| هەولێر | ١٩٥٧ | ١١٥١ گوند |
| | ١٩٨٧ | ٣١٦ گوند |

ســەرژمێری دروســتی گونــدەکانی پارێزگــاری دهــۆکم بــەپێی ســاڵەکان بەردەســت نەکــەوت، بــەڵام بەبــەراورد لەگــەڵ کــەرکوك و هــەولێرو ســلێمانی لــەدهۆکیش بەهــەمان شێوە گوندەکان تێکدراون و بەرشاڵاوی راگواستن کەوتوون.

بەنسبەت سنووری مەخمووریش بەم شێوەیە بووە:

| شوێن | ساڵ | ژمارەی گوند |
|---|---|---|
| مەخموور | ١٩٥٧ | ٢٣٤ گوند |
| | ١٩٧٧ | ٢٠٦ گوند |
| | ١٩٨٧ | ٦١ گوند |

ئەو (٦١) گوندەش هەر هەمووی عەرەبنشین کرابوون.

---

١١٢- میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لەعێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد... ل١٨٣.

# چەند بەڵگەنامەیەك

چەند بەڵگەنامەیەك كە گوزارشت لەشاڵاوە بەدناوەكانی ئەنفال و گرتنی ژن و منداڵ و پیاوی كوردو رووخاندنی گوندەكان و بەتاڵانبردنی مەڕو ماڵات و سامانی كوردستان دەكەن (ئەم بەڵگەنامانە مشتێكن لەخەرواریك) لەم كتێبەدا بڵاویان دەكەینەوە..

١-بەڵگەنامەی ژمارە (١) یەك، نووسراوێكە بەژمارە ١٢٧م لە ١٩٨٨/٤/١٢دا لەفەرماندەیی فەیلەقی یەكی سوپای داگیركەری عێراق بۆ فەرماندەیی فەیلەقی دوو- هێزی خالد بن وەلید، كە تایبەتە بەئەنفالكردنی ناوچەی قەرەداغ و داواكراوە چ شتێكیان پێویستە تا بۆیان بنێرن بۆ ئەوەی كۆنترۆڵی تەواوی ناوچەكە بكەن، بەپێی داوای سەركردایەتی گشتی هێزە چەكدارەكانی عێراق.

٢- بەڵكەنامەی ژمارە (٢) دوو، وەڵامی بەڵگەنامەی ژمارە (١) یەكە، كە نووسراوێكە بەژمارە ١٦٩ لە ١٩٨٨/٤/١٥ لەفەرماندەیی فەیلەقی دوو- هێزی خالد بن وەلید بۆ فەرماندەیی فەیلەقی یەك، داوا كراوە ٨ هەلیكۆپتەرو ٢٠ ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر بنێرن بۆ گواستنەوەی لیوای ٣٩ لەناوچەی پیرەمەگرونەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ، هەروەها داواكراوە پارێزگاری ئاسمانی بۆ ئۆپەراسیۆنەكە دابینبكرێت كە بڕیار بووە ١٩٨٨/٤/٢٠ جێبەجێ بكرێت.

٣-بەڵگەنامەی ژمارە (٣) سێ، باس لەدەستپێكردنی ئۆپەراسیۆنەكە بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ دەكات كە نووسراوێكە بەژمارە ١٤٢ لە ١٩٨٨/٤/٢٠ لەلایەن فەیلەقی یەكەوە بۆ فەرماندەیی گشت هێزە چەكدارەكانی عێراق نێردراوە، باس لەوە دەكات كە لەئۆپەراسیۆنی ناوچەی قەرەداغ (٢٥٠٠) دوو هەزارو پێنج سەد كەسیان لەژن و پیاو گرتووەو دەستیان بەسەر كۆمەڵێ چەك و تەقەمەنی (لەقۆپی قەرەداغ)دا گرتووە (١٠ ئاربی چی ٧، ٢٠٠ كلاشینكۆف، ١٠٠٠ رومانە)، هەروا نووسراوە كەسە گیراوەكان و چەكەكان لەبارەگای فەیلەیقن و چاوەڕوانی رێنمایین لەم بارەوە.

٤-بەڵگەنامەی ژمارە (٤) چوار، نووسراوێكە بەژمارە ٤٨ لە ١٩٨٨/٤/٢١ كە لەوەزارەتی بەرگری عێراق- هۆبەی ئەمن ئاراستەی فەرمانگەی ئەمنی سەربازی

کراوه. داواکراوه لیژنەیەکی ئەمنی لەفەرمانگەکەوه بچێتە فەرماندەیی فەیلەقی یەك بۆ جێبەجێ کردنی کاری تایبەت و، دەبێ ئەم (مهمه)یەش لەماوەی (٢٠) کاتژمێردا جێبەجێ بکرێت، ئەم بەڵگەنامەیە وەڵامی بەڵگەی ژمارە (٣) سێیە.

٥-بەڵگەنامەی ژمارە (٥) پێنج، نووسراوێکە بەژمارە ١٦٥ ق لە ١٩٨٨/٤/٢١ لەفەرماندەیی فەیلەقی دوو- هێزی خالد بن وەلید بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی یەك، ئاماژە بەوە دەکات کە نامەی ١٢٥ لە ١٩٨٨/٤/٢١ (نهێنیو یەکسەر)، ناوەڕۆکەکەی لەلایەن لیوای ٣٩ جێبەجێ کراو، ئۆپەراسیۆنی ناوچەی قەرەداغیش لەلایەن هەمان لیواوە لەڕێکەوتی ١٩٨٨/٤/٢٠ تەواو بووە.

٦-بەڵگەنامەی ژمارە (٦) شەش، نووسراوێکە بەژمارە ١٥٢ لە ١٩٨٨/٤/٢٣ لەفەرماندەیی فەیلەقی دوو بۆ فەرماندەیی فەیلەقی یەك، باس لەڕووخاندن و وێرانکردنی تەواوی گوندەکانی ناوچەی قەرەداغ و بەتاڵانبردنی (٢٥٠٠) دوو هەزارو پێنج سەد سەر ئاژەڵ دەکات و دەڵێ ئەو (٢٥٠٠) سەر ئاژەڵە لەبارەگای لیوای ٣٩ لە پیرەمەگروون پارێزراون و ڕێنماییتان لەم بارەییەوە چییە.

٧-بەڵگەنامەی ژمارە (٧) حەوت؛ نووسراوێکە بەژمارە ٣/م خ لە ١٩٨٨/٤/٢٣، لەفەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراق بۆ فەرماندەیی فەیلەقی یەك (وەڵامی بەڵگەنامەی ژمارە (٣) سێیە)، ئەم بەڵگەنامەیە گوزارشت لە بێ سەرو شوێن کردنی گیراوەکانی ئەنفالەکان دەکات. لەم بەڵگەنامەیەدا هاتووە: کە ئەو گیراوانەی ژمارەیان (٢٥٠٠) دوو هەزارو پێنج سەد کەسە بەم شێوەیە دابەشیان بکەن، پیاوەکان بۆ فەرماندەیی فەیلەقی چوار بنێرن و، ژنەکان بۆ فەرماندەیی فەیلەقی سێ بنێرن و، منداڵەکانیش بۆ سەربازگەی مەشقی (الدروع) لەتکریت بنێرن. با ناردنەکەشیان بەئۆتۆمبێلی تایبەت و بەهاوڕێیەتی دوو نوێنەری ئەوان بێت.

هەروەها لە بەشی بەڵگەنامەکانی ئەم کتێبەدا کۆمەڵێ بەڵگەنامە لەبارەی هێنان و نیشتەجێکردن (استیطان)ی عەرەب بۆ کەرکوك بڵاوکراوەتەوە. ئەم بەڵگەنامانەمان وەك نموونەیەك هێنایەوە، کە مشتێکن لەخەروارەهای بەڵگەنامە پڕ شەرمەزارییەکانی ڕژێمی داگیرکەری عێراق. جگە لەبەڵگەنامەکان کۆمەڵە وێنەیەکیشمان بڵاوکردۆتەوە کە گوزارشت لەوێرانکردنی کوردستان دەکەن.

# قۆناغی چوارەم

# ١٩٩١ - تائێستا

# پاش راپەڕین

دوای ئەوەی گەلی کوردستان لەبەهاری ١٩٩١دا لەراپەڕینێکی جەماوەری بێوێنەدا، توانی زۆربەی هەرە زۆری شارو شارۆچکەکانی کوردستان بەکەرکوکی شادەماری ئابووری کوردستانیشەوە رزگار بکات و دام و دەزگا سەرکوتکرەکانی رژێمی عێراق رابماڵێو کۆتی دیلیو چەوسانەوە بپسێنێو، (هەرچەندە رژێم جارێکی تر بەئاگرو ئاسن کەوتەوە گیانی گەلی کوردستان بەلام لەئەنجامدا ئیرادەی هەق بەسەر زولم و زۆریدا سەرکەوت)، پاشان لەئەزموونێکی بێوێنەدا گەلی کوردستان یەکەم پەرلەمانی کوردستانی هەڵبژاردو، پەرلەمانیش متمانەی بەیەکەم حکومەتی کوردستانداو، کورد خۆی حوکمی خۆی کردو باشووری کوردستان لەلایەن هێزی نێودەوڵەتی پارێزگاری لێکراو رێ لەرژێمی عێراق گیراو بواری نەدرا وەك جاران بکەوێتە قڕکردنی کوردو دەربازی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان بێت. ئەوە وای لەرژێمی عێراق کرد کە بکەوێتە گیانی ئەو کوردانەی لەژێر دەسەلاتی ئەودا ماون و هەوڵبدات بۆ بەعەرەبکردنی شارو شارۆچکە کوردستانییەکانی ژێر دەسەلاتی، بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێ شێوازی نامرۆڤانەو بێ رەوشتانەی دژ بەگەلی کوردستان گرتەبەر. وەك:

## ١-راگواستن و دەرکردنی بەردەوامی کورد لەشارەکانی ژێر دەسەلاتیدا بۆ شارەکانی کوردستان و باشووری عێراق و، هێنانی عەرەب بۆ شوێنی ئەوان:

رژێمی عێراق بەبەردەوامی خەڵکی کورد لەشارە کوردستانییەکانی ژێر دەسەلاتیدا رادەگوازێو دەریدەکات وەك ئەوەی کە بەردەوام لە(کەرکوك و مەخموورو گوێڕو قەراج و کەندێناوەو خانەقین و موسڵ و شنگال و شێخان و شوێنانی تر) ئەنجامی دەدات، دوای دەرکردنی کورد لەم شوێنانەدا عەرەب دێنێتە شوێنیان و نیشتەجێیان دەکات، واتە کورد دەباو عەرەب دێنێ! خەڵکەکەش سەرپشك دەکا کە بەرەو باشووری عێراق دەڕۆن یا بەرەو کوردستانی ئازاد، ئەوەی بەرەو باشوور بچێت دەتوانێ هەندێ کەل و پەلی ناو ماڵ لەگەڵ خۆیدا ببات، بەلام ئەوەی بۆ کوردستانی

ئازاد بێت ئەوا هیچ! ئەم هەولانەی ڕژێم بۆ دەرکردنی خەڵك لە ١٩٩١ەوە تائێستا (٢٠٠٢) بەردەوامەو، تارژێمیش بمێنێ بەردەوام دەبێت. بۆ پەرت و بڵاو کردنی کوردو نەهێشتنیان لەشارەکانی کوردستانی ژێر دەسەڵاتیدا ڕژێمی عێراق ساڵی ١٩٩٢ بڕیارێکی دەرکردووە بۆ ئەوەی خەڵکی کورد بۆ شارەکانی باشووری عێراق کۆچ بکەن، لەبڕیاری ژمارە (١٩٠)ی ١٩٩٢/٧/١٦ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) هاتووە: (هەر کەسێکی ناوچەی ئۆتۆنۆمی "مەبەست باشووری کوردستانە. غ.م" مافی هەیە لە هەر پارێزگایەکی تری عێراقدا "جگە لەپارێزگای موسڵ و کەرکوك و دیالی" پارچە زەوی هەبێت و قەرزی بانکی خانووبەرەشی پێدەدرێت). ڕژێمی عێراق دەیەوێت بەو بڕیارەی وا لەکورد بکات کە بەرەو پارێزگاکانی تری عێراق بڕون و لەشارەکانی کوردستان نەمێنن تا عەرەبیان بێنێتە شوێن و کوردیش پەرت و بڵاو بکات.

بەپێی ئامارێکی پارێزگای کەرکوك ژمارەی خێزانە دەرکراوەکانی کەرکوك لەساڵی ١٩٩١ تا ٢٠٠١/٩/٢١ نزیکەی (٤٤١٧) خێزان دەبێت، کە دەکاتە (٢٥٨٠٢) کەس، بەم شێوەیە:

أ- ساڵی ١٩٩١ تا ١٩٩٦ نزیکەی (٣٥٠٠) خێزان دەرکراون کە دەکاتە (٢٠٢٠٠) کەس.

ب- لەساڵی ١٩٩٧- تا ٢٠٠١/٩/٢١ بەپێی سەرژمێری لیژنەی باڵای دەرکراوەکان (٩١٧) خێزان دەرکراون کە دەکاتە (٥٦٠٢) کەس.

ج- نزیکەی ١٠٠٠ خێزانی تورکمان لەشاری کەرکوك دەرکراون کە دەکاتە (٥٠٠٠) کەس.

جگە لەو دەرکراوانە ژمارەیەکی زۆریش بۆ باشووری عێراق و دەڤەری سلێمانی ڕاگوێزراون. ئەم ئامارەی سەرەوە تەنها ئەوانە بوون کە بۆ پارێزگای هەولێر ڕاگوێزراون.

دەرکراوەکانی کەرکوك ئەوانەی کە لەپارێزگای هەولێر نیشتەجێن دابەشی سەر ئەم شوێنانە بوون (بنەسڵاوە، دارەتوو، تۆبزاوە، جدیدە، خەبات، کەورگۆسك، کانی قرژاڵە، کەسنەزان، دیانا، قوشتەپە، ناو شاری هەولێر)و، ژمارەیەکیشیان لەپارێزگای دهۆك نیشتەجێن. هەروەها ئەو دەرکراوانەی کەرکوك کە لەپارێزگای سلێمانی

نیشتەجێن دابەشی سەر ئەم شوێنانە بوون: (سلێمانی، رانیە، بەردەقارەمان، سەربازگەی سەلام، کفری، کەلار، چەمچەماڵ، دەربەندیخان، بازیان، تەکییە، باینجان، کەمپی شانەدەری) ژمارەیان (١٦٠٠٠) خێزانە کە دەکاتە (٩٥٠٠٠) کەس[١١٤]، ژمارەی ئەو دەرکراوانەی کە رەوانەی پارێزگای دهۆکیش کراون بەپێی ئاماری لیژنەی باڵای دەرکراوەکان (٣٥٠) خێزانەو دەکاتە (٢١٠٠) کەس.

بەپێی ئەو ئامارەی کە لای لیژنەی مافی مرۆڤی پەرلەمانی کوردستانە. ژمارەی دەرکراوەکان (لە ١٩٩٦ تا ٢٠٠٢/٥/١٨) بەم شێوەیەیە: (٩٠٣) خێزان لەکەرکوك دەرکراون کە دەکاتە (٥٢٩٥) کەس سەیری خشتەی ژمارە (١) یەك بکە، ژمارەی خێزانە دەرکراوەکانی مەخموورو گوێرو کەندێناوەو قەراج (٢٦٧) خێزانە کە دەکاتە (١٨٠٦) کەس، سەیری خشتەی ژمارە (٢) دوو بکە. هەروەها ژمارەی خێزانە دەرکراوەکانی موسڵ و شنگال و شێخانیش (٦٩) خێزانە کە دەکاتە (٣٨٦) کەس، سەیری خشتەی ژمارە (٣) سێ بکە. خێزانە دەرکراوەکانی بەغداو پارێزگاکانی تریش (٤٦) خێزانە کە دەکاتە (٢٦٨) کەس، سەیری خشتەی ژمارە (٤) چوار بکە.

| ساڵ | ژمارەی خێزانی دەرکراو | ژمارەی کەس |
|---|---|---|
| ١٩٩٦ | ٢٤ خێزان دەرکراوە | ٧٦ کەس |
| ١٩٩٧ | ٢١٤ خێزان دەرکراوە | ١٣٠٩ کەس |
| ١٩٩٨ | ١٩٦ خێزان دەرکراوە | ١٠٨٩ کەس |
| ١٩٩٩ | ١٦٢ خێزان دەرکراوە | ٩٧٥ کەس |
| ٢٠٠٠ | ١٦٦ خێزان دەرکراوە | ٩٥٣ کەس |
| ٢٠٠١ | ١٢٠ خێزان دەرکراوە | ٦٥٢ کەس |
| تا ٢٠٠٢/٥/١٨ | ٢١ خێزان دەرکراوە | ١٤١ کەس |
| کۆی گشتی | ٩٠٣ خێزان | ٥٢٩٥ کەس |

**خشتەی ژمارە (١) ژمارەی خێزان و کەسە دەرکراوەکانی کەرکوك و دەوروبەری دەخاتە روو.**

| ساڵ | ژمارەی خێزانی دەرکراو | ژمارەی کەس |
|---|---|---|

١١٤- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢٦٨٠ی ٢٠٠٢/٢/١٠.

| ١٩٩٦ | ١٠ خێزان دەرکراوە | ٣٩ کەس |
|---|---|---|
| ١٩٩٧ | ٧ خێزان دەرکراوە | ٦٣ کەس |
| ١٩٩٨ | ٢٧ خێزان دەرکراوە | ١٦٤ کەس |
| ١٩٩٩ | ٩ خێزان دەرکراوە | ٨٠ کەس |
| ٢٠٠٠ | ٢١ خێزان دەرکراوە | ١٤٨ کەس |
| ٢٠٠١ | ١٦٥ خێزان دەرکراوە | ١١٠٨ کەس |
| تا ٢٠٠٢/٥/١٨ | ٢٨ خێزان دەرکراوە | ٢٠٤ کەس |
| کۆی گشتی | ٢٦٧ خێزان | ١٨٠٦ کەس |

**خشتەی ژمارە ( ٢ ) ژمارەی خێزان و کەسە دەرکراوەکانی ( مەخموور و قەراج و گوێڕو کەندیناوە ) دەخاتە روو.**

| ساڵ | ژمارەی خێزانی دەرکراو | ژمارەی کەس |
|---|---|---|
| ١٩٩٦ | ٥ خێزان دەرکراوە | ٢١ کەس |
| ١٩٩٧ | ٩ خێزان دەرکراوە | ٣٧ کەس |
| ١٩٩٨ | ٨ خێزان دەرکراوە | ٦١ کەس |
| ١٩٩٩ | ٣ خێزان دەرکراوە | ١٨ کەس |
| ٢٠٠٠ | ٢٨ خێزان دەرکراوە | ١٥٨ کەس |
| ٢٠٠١ | ١٥ خێزان دەرکراوە | ٨١ کەس |
| تا ٢٠٠٢/٥/١٨ | ١ خێزان دەرکراوە | ١١ کەس |
| کۆی گشتی | ٦٩ خێزان دەرکراوە | ٣٨٦ کەس |

**خشتەی ژمارە ( ٣ ) ژمارەی خێزان و کەسە دەرکراوەکانی ( موسڵ و شنگال و شێخان ) دەخاتە روو.**

| ساڵ | ژمارەی خێزانی دەرکراو | ژمارەی کەس |
|---|---|---|
| ١٩٩٨ | ٧ خێزان دەرکراوە | ٣٦ کەس |
| ١٩٩٩ | ٩ خێزان دەرکراوە | ٤٠ کەس |
| ٢٠٠٠ | ١٨ خێزان دەرکراوە | ١٢٢ کەس |
| ٢٠٠١ | ١٢ خێزان دەرکراوە | ٧٠ کەس |
| کۆی گشتی | ٤٦ خێزان | ٢٦٨ کەس |

**خشتەی ژمارە (٤) ژمارەی خێزان و کەسە دەرکراوەکانی (بەغداو پارێزگاکانی باشوور) دەخاتە روو.**

**شالاوی راگواستن و دەرکردنی کوردان لەلایەن رژێمی داگیرکەری عێراق زیاتر ناوچە دەوڵەمەندەکانی کوردستانی گرتۆتەوەو بەپلەی یەکەم جەخت لەسەر ئەم ناوچانە کراوە (کەرکوك، مەخموور، خانەقین)و هەروا کوردی ناو شاری بەغداو شارەکانی تریش بەرشالاوی راگواستن کەوتوون و پاشتر عەرەب هێنراونەتە شوێنیان، ئەگەر سەیر بکەین رژێمی عێراق لە ١٩٩٧/٤/١ تا ١٩٩٨/١١/٢٨ (٤٤٩) خێزان کە دەکاتە ٢٩١٧ کەس لەو شارانە تەنها بۆ پارێزگای هەولێر راگواستووە، سەیری خشتەی ژمارە (٥) پێنج بکە.**

| شوێنی دەرکردن | ژمارەی خێزانە دەرکراوەکان | ژمارەی کەسەکان | شوێنی نیشتەجێکردن |
|---|---|---|---|
| پارێزگای کەرکوك | ٤١٠ خێزان دەرکراوە | ٢٦٣٢ کەس | هەولێر |
| قەزای مەخموور | ٢٦ خێزان دەرکراوە | ٢٠٣ کەس | هەولێر |
| قەزای خانەقین | ١١ خێزان دەرکراوە | ٦٠ کەس | هەولێر |
| بەغداو رومادی | ٢ خێزان | ٢٢ کەس | هەولێر |
| کۆی گشتی | ٤٤٩ خێزان | ٢٩١٧ کەس | |

**خشتەی ژمارە (٥) ژمارەی خێزان و کەسە دەرکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی رژێمی عێراق لەماوەی ١٩٩٧/٤/١ تا ١٩٩٨/١١/٢٨ بۆ پارێزگای هەولێر دەخاتە روو.**

**پەرلەمانی ئەوروپی کە ٢٠٠٢/٩/٤ کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لەستراسبۆرگ بەست ، ژمارەی دەرکراوەکانی کوردستانی لەلایەن رژێمی عێراقەوە بە ٨٠٠٠٠٠ هەشت سەد**

هەزار خێزان مەزندە کردووەو، داوای لەعێراق کردووە کە دەستبەرداری سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن بێت.

بەم شێوەیە رژێمی عێراق تائێستا بەردەوامە لەسەر راگواستن و دەرکردنی کوردو رۆژانەش لەهۆیەکانی راگەیاندنی کوردستان هەواڵی دەرکردنی خێزان و ژمارەی کەسەکان بڵاو دەکرێنەوە.

## ٢-گۆڕینی ناوی گەڕەکی شارەکان و ناوی شارۆچکەو گوندەکان

رژێمی عێراق پێشتریش ناوی شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستانی دەگۆڕی وەك ئەوەی لە ١٩٧٦ ناوی کەرکوکی گۆڕی بە (التأميم)، لەماوەی ١٩٩١ تائێستاش لەسەر ئەم سیاسەتەی بەردەوامەو دەستی داوەتە گۆڕینی ناوی گەڕەکەکانی ناو شاری کەرکوك و ناوی شارۆچکەو گوندەکان و ناوی مزگەوت و قوتابخانەو شوێنە گشتییەکان. بۆ نموونە لەناو شاری کەرکوك، ناوی گەڕەکەکانی بەم شێوەیە گۆڕیوە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١- | رەحیماوا | کراوەتە | حي الاندلس |
| ٢- | مسەلا | کراوەتە | حي خلفاء |
| ٣- | گاورباخی | کراوەتە | حي عدنان |
| ٤- | حەمام عەلی بەگ | کراوەتە | حي الفارس و حي الأمراء |
| ٥- | ئازادی | کراوەتە | حي النخوة |
| ٦- | پیریادی | کراوەتە | حي الصفا |
| ٧- | . تد | | |

هەروا ناوی مزگەوتەکانیشی بەم شێوەیە گۆڕیوە:

| | | |
|---|---|---|
| ١-مزگەوتی مەلا سەعیدی رۆژبەیانی | کراوەتە | جامع حارث بن زيد |
| ٢-مزگەوتی سەید ئەحمەدی خانەقا | کراوەتە | جامع القادسية |
| ٣-مزگەوتی ئیبراهیم پاشا | کراوەتە | جامع القعقاع |
| ٤-مزگەوتی عەلی بەگ | کراوەتە | جامع عباس بن عبدالمطلب |
| ٥-مزگەوتی مەلا ئەحمەدی زەند | کراوەتە | جامع عمر بن عاص |
| ٦- مزگەوتی ئەحمەد ئاغا | کراوەتە | جامع سهيل بن عمر |
| ٧-مزگەوتی ولی پاشا | کراوەتە | جامع قعقاع بن عمر التميمي |
| ٨-. تد | | |

هەروەها ناوی قوتابخانەکانیش گۆڕاون و بەم ناوانە ناونراون:

(روضة الاحفاد، روضة المروج، مدرسة الخليج العربي، مدرسة رابعة العدوية، مدرسة القرطبة، متوسطة نسيب الانصاري، متوسطة سيف سعد، متوسطة البعث، اعدادية القائد صدام، ثانوية اليقظة، ثانوية التحرير، ثانوية الثورة. تد). ئەم گۆڕینانە زۆرن، ئەوانەشمان تەنها وەك نموونە هێنایەوە. ناوی شارۆچکەکانیش لەلایەن رژێمەوە گۆڕاون وەك ئەوەی (پردێ)ی کردۆتە (النهرين)، هەروەها ناوە کوردییەکانی گوندەکانیشی گۆڕیوە بۆ ناوی عەرەبی، بۆ نموونە لەدەشتی مەخمورو قەراج و کەندێناوە ناوی گوندەکانی ئاوا لێ کردووە:

| | | |
|---|---|---|
| ١-شۆڕەزەرتکە | کراوەتە | الفرات |
| ٢-سێ چارە | کراوەتە | عاگوب |
| ٣-گردە شینە | کراوەتە | تل الحيال |
| ٤-گردی گۆم | کراوەتە | قرية السلام |
| ٥-گاوەرە | کراوەتە | الرسالة. . تد. |

## ٣-هێنانی عەرەب بۆ سەر زەوی‌و زاری کوردان و دروستکردنی (مستوطنات) بۆیان:

پاش ئەوەی رژێمی عێراق ناوی گەڕەك و شوێنە گشتییەکانی شاری کەرکوك و دەوروبەری‌و ناوی شارۆچکەکان و ناوی گوندە کوردستانییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی گۆڕی‌و ناوەکانیانی کردن بەعەرەبی، ئنجا دەستی کرد بەهێنانی عەرەب بۆ سەر زەوی‌و زارو ماڵی کوردان لەو شوێنانەو دروستکردنی (مستوطنات) بۆیان، بۆ ئەم مەبەستەش لەشوێنی گوندە رووخاوە کوردستانییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا (مستوطنات)ی بۆ عەرەب دروستدەکردو هەموو هاوکاری‌و ئاسانکارییەکیشی پێ دەبەخشین، جگە لەدروستکردنی خانوو بۆیان زەوی کشتوکاڵی جوتیارانی کوردیشی بەسەردا دابەشدەکردن و قوتابخانەو بنکەی تەندروستی بۆ دروستدەکردن ئاوو کارەباشی بۆ رادەکێشان و ساڵانەش تۆو و پەینی کیمیاییان پێدەبەخشێت بۆ داچاندنی زەوییەکان و، تراکتۆرو دەراسەشیان پێدەدات و سەرەڕای ئەمانە چەکداریشیان دەکات، شایانی باسە رژێمی عێراق لەدروستکردنی ئەو

(مستوطنات)انەدا سوودێکی زۆر لەبڕیاری (٩٨٦) بڕیاری (نەوت بەخۆراك) وەردەگرێت. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٧٤).

ئەو (مستوطنات)انە هێندە زۆرن مەگەر لە هەر ناوچەیەکدا چەند نموونەیەك بێنینەوە، بۆ نموونە ٢٦ (مستوطنة) لەسنووری داقوق بۆ عەشیرەتەکانی (ریاش، بەحر، حنیحن، بەدوی شەمەرو عگلەو لهێب) دروستکراون، کە هەر (مستوطنة)یەك (٥٠-٢٠٠)ماڵی تێدایە، لەتازەخورماتو ١٠ (مستوطنة) بۆ ٣٢٣ خێزانە عەرەبی عەشیرەتی (ئەلبوحەمزەو عەبادین و بیجات و ئەلبوسالح و حنیحن) دروستکراوە، گوندەکانی قەفارو تۆبزاوەو سۆنەگولی یان داوەتە عەشیرەتی (جەوالە)و گوندەکانی بەیخان و پیریجان و گۆگچەیان داوەتە عەشیرەتی (موفەڕەج)، بۆ زانین ئەو عەرەبانەی هاتوونەتە ئەو شوێنانە ئۆتۆمبێل و تەنکەری ئاوو تراکتۆریشیان پێدراوە.

لەبەر ئەوەی گەورەترین شاڵاوی بەعەرەبکردنی کوردستان لەسەر شاری کەرکوکە، بەپێویستی دەزانین کە لیستێك بەناوی ئەو (مستوطنات)انە لەناو شاری کەرکوك و دەوروبەری کەرکوك، لەگەڵ ناوی ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی کە هاتوونەتە ناو شاری کەرکوك و دەوروبەری بخەینە روو:

أ- ئەو (مستوطنات)انەی لەناو کەرکوك دروستکراون:

| | | |
|---|---|---|
| ١.الف دار- عرفة | ١١-القادسية الثانية | ٢١-مجمع سيد سفيان |
| ٢-الفين دار - عرفة | ١٢-حي البعث | ٢٢-مجمع دارامان |
| ٣-حي الوحدة | ١٣-حي ١ حزيران الاولى | ٢٣-دور الضباط |
| ٤-حي الحرية | ١٤-حي ١ حزيران الثانية | ٢٤-دور الري |
| ٥-مجمع الصيادة الاولى | ١٥-حي الخضراء | ٢٥-حي الشرطة |
| ٦-مجمع الصيادة الثانية | ١٦-حي الخضراء الثانية | ٢٦-حي العسكري |
| ٧-مجمع الصيادة الثالثة | ١٧-مجمع الاسكان | ٢٧-حي غرناطة |
| ٨-قرية السادات | ١٨-حي الشهداء الاولى | ٢٨-دور الامن |
| ٩-دوميس | ١٩-حي الشهداء الثانية | ٢٩-حي العروبة |
| ١٠-القادسية الاولى | ٢٠-شقق النفط | ٣٠-حي قتيبية |

**ب- ئەو ( مستوطنات )انەی لەدەوروبەری کەرکوك دروستکراون:**

| ١- مجمع الصمود | ٩- مجمع البوغيث | ١٧- مجمع حديدين |
|---|---|---|
| ٢- مجمع ٧ نيسان | ١٠- مجمع البوغنام | ١٨- مجمع يافا |
| ٣- مجمع ألبورياش | ١١- مجمع عمر بن عبدالعزيز | ١٩- مجمع حيفا |
| ٤- مجمع الأنتصار | ١٢- مجمع النخوة | ٢٠- مجمع خضراء |
| ٥- مجمع الجديدة | ١٣- مجمع ألبوعز | ٢١- مجمع فدائي |
| ٦- مجمع الجهاد | ١٤- مجمع المعاضيدي | ٢٢- مجمع يرموك |
| ٧- مجمع حطين | ١٥- مجمع السادة | ٢٣- مجمع القادسية |
| ٨- مجمع سيد پاشا | ١٦- مجمع النعيم | ٢٤- مجمع سيف سعد |

**ج- ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی بۆ کەرکوك و دەوروبەری هێنراون:**

| ١-ألبوهزاع | ٩-ألبوعگله | ١٧-الحربية | ٢٥-بيجات |
|---|---|---|---|
| ٢-ألبورياش | ١٠-بدو | ١٨-دراويش | ٢٦-ألبوصالح |
| ٣-گوراغول | ١١-دلێم | ١٩-ألبوحمزة | ٢٧-جهواله |
| ٤-ألبوجيم | ١٢-لهێب | ٢٠-حمدانية | ٢٨-العبيد |
| ٥-ألبوزناطرة | ١٣-جنابات | ٢١-بەحر | ٢٩-الحديدي |
| ٦-ألبوغنام | ١٤-ألبومفرج | ٢٢-حنيحن | ٣٠-النعيم |
| ٧-ألبوشاهر | ١٥-ألبوعزة | ٢٣-شەمەر | ٣١-معاذ بن جبل |
| ٨-عزاوي | ١٦-بني عز | ٢٤-عەبادين | |

**لەدوای کەرکوك؛ زۆرترین (مستوطنة) لەسنووری قەزای مەخموور دروستکراوەو سەرجەم گوندەکانیش دابەشی سەر عەرەبی هێنراو کراون، بەپێویستی دەزانین کە بەهەمان شێوەی کەرکوك (مستوطنات)ە دروستکراوەکانی ناو مەخموورو دەوروبەری مەخموورو ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی بۆ ناوچەکە هێنراون بخەینە روو:**

أ-ئەو ( مستوطنات )انەی لەناو شاری مەخموور دروستكراون:

| ١-حي العسكري | ٦-حي الزراعة |
| --- | --- |
| ٢-حي صدام | ٧-حي الشرطة |
| ٣-دور الأمن | ٨-حي الضباط- لەپشت سەدەی مەخموور، تازە دروستدەكریٚ. |
| ٤-دور الرفاق | ٩-حي عدي- نزيك گوندی قەسران، تازە دروست دەكریٚ |
| ٥-دور الموظفين | |

ب-ئەو ( مستوطنات )انەی لەدەوروبەری مەخموور دروستكراون:

| ١-الفرات- لەگوندی شۆڕەزەرتكە | ١٠-قرية عاگوب- لەگوندی سێچارە |
| --- | --- |
| ٢-سيف القائد- نزيك ديبەگە | ١١-پەڵكانە- لەنزيك سەرگەڕان |
| ٣-قرية السلام- لەگوندی گردی گۆم | ١٢-التحرير- لەگوندی گردقۆشەنە |
| ٤-الرسالة- لەگوندی گاوەرە | ١٣-قرية الفارس- لەگوندی گۆمەشین |
| ٥-عدنانيە- لەگوندی مەلاقەرە | ١٤-قرية البعثي- لەگوندی سیرمە |
| ٦-تل الحيال- لەگوندی گردەشینە | ١٥-قرية النصر- لەگوندی دووگردكان |
| ٧-الوحدة- لەگوندی تەلەخێم | ١٦-مجمع ام المعارك- لەگوندی خەزنە |
| ٨-القدس- لەگوندی سەرگەڕان | ١٧-مجمع التحدي- لەگوندی میلەهۆرت |
| ٩-بڵند گوێڕ- لەنزيك گوندی مەلاقەرە | ١٨-قرية شهيد شامل- لەگوندی زمارەی گەورە |

ج- ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی بۆ مەخموورو دەوروبەری هێنراون:

| ١-لهيب | ٥-طي | ٩-صديد | ١٣-الحديديين |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢-شليلە | ٦-شەمەر | ١٠-جوالە | ١٤-نعێم |
| ٣-شێخ زيدان | ٧-سنبس | ١١-دلێم | ١٥-المريدين |
| ٤-سبعاوی | ٨-الجميلي | ١٢-جبور | |

تەواوی گوندەکانی سنووری جوگرافی قەزای مەخموور بەناحیەکانەوە دراونەتە عەرەب (جگە لەگوندی دێمەکار)[115] کە رووبەرەکەیان بەشێوەیەکی گشتی دەکاتە "١,١٦٢,٣٣٨" یەك ملیۆن و سەدو شەست دوو هەزارو سێسەدو سی و هەشت دۆنم و، (سەیری خشتەی ژمارە "٦" بکە) ئێستا عەرەب سەرجەم ئەو رووبەرە زەوییەی داگیرکردووەو بەکاری دەهێنێت و، ئەم رووبەرەش هێندەی رووبەری هەریەك لە"قەتەر"و "بەحرێن"ە[116].

| ز | ناوی ناحیە | ژمارەی گوند | رووبەرەکەی بەدۆنم |
|---|---|---|---|
| ١. | سەنتەری قەزای مەخموور | ٣١ گوند | ١٨٥,٦٧٤ دۆنم |
| ٢. | ناحیەی کەندێناوە | ٤٤ گوند | ٢٤٤٦,٧٢٧ دۆنم |
| ٣. | ناحیەی گوێر | ٥٠ گوند | ٣٠٢,٠٢٢ دۆنم |
| ٤. | ناحیەی قەراج | ٧١ گوند | ٤٢٧,٩١٥ دۆنم |
| | کۆی گشتی | ١٩٦ گوند | ١,١٦٢,٣٣٨ دۆنم |

**خشتەی ژمارە ( ٦ ) سەرژمێری رووبەری زەوییە بەعەرەبکراوەکانی قەزای مەخموور دەردەخات.**

## ٤-گۆڕینی نەتەوە" لەکوردەوە بۆ عەرەب

یەکێك لەسیاسەتە گڵاوەکانی رژێمی عێراق بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان لەم قۆناغەدا بریتییە لەگۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی لەکوردەوە بۆ عەرەب، کە لەلایەن رژێمەوە بە(تصحيح القومية) ناسراوەو خراوەتە چوارچێوەیەکی یاسایی و بڕیاری ژمارە ١٩٩ لە ٢٠٠١/٩/٦ لەلایەن بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق)ەوە بۆ دەرچووە، (بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٦٢) لەبڕگەی یەکەمی بڕیارەکەدا هاتووە کە هەر عێراقییەك تەمەنی ١٨ساڵی تەواو کرد بۆی هەیە ناسنامەی نەتەوەیی خۆی بۆ نەتەوەی عەرەب بگۆڕێت، لەبڕگەی دووەمدا هاتووە کە داواکاری گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی پێشکەش بەو فەرمانگەی رەگەزنامەو کاروباری

---

١١٥-دێمەکار: گوندێکی سەر بەقەزای مەخموورەو بەبڕیاری (سەددام) ماوەو تێکنەدراوەو، دراوەتە کابرایەکی کورد بەناوی (عزیز بندیان).

١١٦- د.انور مهدي صالح و يوسف يحيى طعماس، الجغرافية العامة للقارات. . . ص٧٢-٧٣.

شارستانیه دەکرێ کە ناوی تێدا تۆمار کراوە، لەبڕگەی سێیەمیش ئاماژە بەوە دراوە کە لەماوەی ٦٠ رۆژدا بەرێوەبەری فەرمانگە وەڵامی داواکە بداتەوە، لەبڕگەی چوارەمیشدا هاتووە کە بڕیاری گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی لەتۆماری شارستانی جێگیر دەبێت و، دەبێتە بنچینە بۆ هەموار کردنی تەواوی تۆمارو بەڵگەنامە رەسمییەکانی تر.

بەڵێ رژێمی عێراق بەم شێوەیە دەیەوێت ناسنامەی نەتەوەیی کورد بگۆڕێت و بیکاتە عەرەب. دەزگاکانی رژێم زۆر لەو کوردانەی ژێر دەسەڵاتیان دەکەن کە بەپێی ئەم بڕیارە ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن، ئەگەرنا دەبێت شارەکە چۆڵ بکەن و بەرەو باشووری عێراق یا کوردستانی ئازاد برۆن. هەروەها بۆ لەخشتەبردنی کوردان دەزگاکانی رژێم پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد، کە ئەگەر خودان گوندەکان ببنە عەرەب ئەوا گوندەکانیان بەزەوییەکانەوە دەدرێتەوە، بەداخەوە هەندێ کورد بۆ ئەم مەبەستە خۆیان کردە عەرەب و گوندو زەوییەکانیشیان پێنەدرایەوە. شایانی باسە رژێمی عێراق بەهیچ شێوەیەك رێ بەعەرەب نادات ناسنامەی نەتەوەیی خۆی لەعەرەبەوە بۆ نەتەوەیەکی تر بگۆڕێت، بگرە ئەگەر ئەمە بکات سزاش دەدرێت. ئەوەتا وەك لەبڕیاری ژمارە ٨٥٠ لە ١٩٨٨/١١/٢٧ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) لەبڕگەی یەکدا هاتووە:

هەر عێراقییەك کە قەومیەتی عەرەب بێت نابێت نەتەوەی خۆی بۆ نەتەوەیەکی تر بگۆڕێت، جا لەبەر هەر هۆیەك بێت. لەبڕگەی دووەمی ئەو بڕیارەشدا هاتووە کە ئەگەر لەبڕگەی یەك دەرچێت بەساڵێك زیندانی سزا دەدرێت[117].

ئەو دوو فاقیەی رژێمی عێراق ئەوپەڕی شۆڤێنیەت و فاشیەتی ئەو رژێمەوە دەردەخات، شتێکی سەیرە لەلایەکەوە زۆر لەکورد دەکات کە بوونی نەتەوەیی خۆی بگۆڕێت و خۆی بکاتە عەرەب، لەلایەکی ترەوە ئەگەر عەرەب ئەوە بکات سزای دەدات. ئەوەش لوتکەی رەگەزپەرستی و کۆنەپەرستی و بێ رەوشتییە!!

## ٥-گواستنەوەی فەرمانبەرانی کوردو هێنانی فەرمانبەری عەرەب بۆ شوێنیان.

رژێمی فاشی عێراق بەمەبەستی کەمکردنەوەی رێژەی کورد لەشارە کوردستانییەکانی ژێردەسەڵاتیدا، پەنای وەبەر هەموو شێوازێك بردووە، ئەوەتا ئەو

---

١١٧- جريدة الوقائع العراقية، العدد ٣٢٣٢، اليوم ١٢/١٢/١٩٨٨.

فەرمانبەرە کوردانەی کە ئامادە نەبوونە ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن و خۆیان بکەن بەعەرەب، لەلایەن رژێمەوە رووبەڕووی گواستنەوە بۆ پارێزگاکان و شارەکانی تری عێراق بوونەتەوە، ئەگەر بەبڕیاری گواستنەوەش پابەند نەبووبن ئەوا بۆ کوردستانی ئازاد راگوێزراون. پاش گواستنەوەشیان، فەرمانبەری عەرەبیان هێناوەتە شوێنیان و لەسەر کاری ئەوان دایانمەزراندوون، ئەو گواستنەوەیەش هەموو پلە فەرمانگەییەکانی گرتۆتەوە لەفەڕاشەوە تا بەڕێوەبەر، کورد بوون بەسە بۆ گواستنەوەیان، سەیری بەڵگەنامەکانی ژمارە (٥٥، ٥٦، ٥٧، ٥٨، ٥٩، ٦٠، ٦١) بکە کە گوزارشت لەگواستنەوەی فەرمانبەرانی کورد لەشارەکانی کوردستان بۆ شارە عەرەبییەکان دەکەن.

لەلایەکی ترەوە رژێمی عێراق فەرمانبەرانی کوردی لەخانووە حکومییەکان دەرکردووەو عەرەبی هێناوەتە شوێنیان و خانووەکانیشی بەناو کردوون. وەك نووسراوی ژمارە ٥٨٩ لە ١٩٩٧/٨/١٦ی پارێزگای کەرکوك بۆ بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرەی کەرکوکی ناردووەو داوا دەکات کەوا خانووی کوردە دەرکراوەکان بدرێتە عەرەبی هێنراو[١١٨].

ئەمەش دەقی نووسراوەکەیە:

بسم الله الرحمن الرحيم

سري وشخصي

محافظة التأميم

شعبة المعلومات السكانية

العدد/ ٥٨٩

التاريخ/ ١٢/ ربيع الثاني ١٤١٨

١٩٩٧/٨/١٦

الى/ مديرية التسجيل العقاري/ التأميم

الموضوع/ تسجيل دور

استنادا لما جاء بكتاب لجنة الشمال- السكرتارية سري وشخصي- المرقم ١٣١٩ في ١٩٩٧/٨/١٣ حصلت موافقة السيد نائب رئيس الجمهورية- رئيس لجنة الشمال-

---

١١٨- ئەم نووسراوە لەرۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢٦٨٩ی رۆژی ٢٠٠٢/٢/٢٠ بڵاو کراوەتەوە.

على تسجيل الدور المبينة ارقامها واسماء اصحابها المرحلين في القائمة المرفقة طيا ومؤشرا إزاء اسم كل مرحل اسم الشخص المستفيد وشمول تلك العقارات بنص القرار ٤٢ لسنة ١٩٨٦ لاتخاذ مايلزم واعلامنا إجراءاتكم بالسرعة.

المرفقات/ قائمة بالأسماء.

الفريق الأول الركن
أياد فتيح الراوي
محافظ التأميم
١٩٩٧/٨

نسخة منه الى/

- لجنة الشمال- السكرتارية- كتابكم اعلاه. للتفضل بالاطلاع مع التقدير.
- وزارة الداخلية/ الداخلية العامة/ م.س/ كتابكم في ١٩٩٧/٦/٢٤ للتفضل بالاطلاع مع التقدير.
- قيادة فرع التأميم للحزب القائد/ للعلم وطيا قائمة بالأسماء مع التقدير.
- مديرية الأمن التأميم/ للعلم وطيا قائمة بالأسماء رجاء.
- مديرية الاسكان/ كتابنا ٣٧٩ في ١٩٩٧/٥/١٥ لإلزام المستفدين موضوعي البحث بالسكن في تلك الدور تنفيذاً للتوجيهات ومتابعة ذلك واعلامنا.
- مديرية خزينة المحافظة.
- مديرية المصرف العقاري/ التأميم.
- لجنة التقدير المركزية الاولى.
- سكرتير لجنة تنظيم سكن المستفيدين.
- سكرتير لجنة بيع دور المرحلين.
- قسم حسابات المحافظة/ كتابنا ٤٧٧ في ١٩٩٧/٦/١٩ لاتخاذ مييلزم حول صرف قيام الدور موضوعة البحث الى أصحابها وأعلامنا اجراءاتكم.

| ت | اسم المرحل | رقم الدار | اسم المستفيد المختصة له الدار |
|---|---|---|---|
| ١ | ابراهيم رحمن رضا | ١٣٤/١١٤ دبس | عبدالكريم فرح عكس |
| ٢. | عبدالله صالح رسول | ٤١٢/١١٤ | سنية جميل عبيد |

| ٣. | كاكه شين محمد حسيب | ١٦١/٢ | حسين علي حسن |
|---|---|---|---|
| ٤. | محمد عزيز صالح | ١٤١/٢ | رزاق حسين فيصل |
| ٥. | كريم مصطفى كريم | ١٢٠/٢ | عباس فاضل عباس |
| ٦ | عبدالرحمن سلام محمد | ١٣/٢٠ | جاسم محمد حسن |
| ٧. | نعمة كريم عبدالله | | سعاد صالح ابراهيم |
| ٨. | مشير محمد ابراهيم | ٨٢/٢ | سري عبدالسلام عارف صالح |
| ٩. | احمد حسين خضر | ٢٤/١١٤ دبس | قاسم ابراهيم حسن |
| ١٠. | محمود محمد قادر | ٢٩/١١٤ دبس | حلوة احمد صالح |
| ١١. | محمود عبدالله رجب | ٩٩٥ | سلام خلف زبون |
| ١٢. | عبدالجبار كريم قرني | ٤١٦ | ريسان حمدان شاوي |
| ١٣. | نجم الدين احمد عزيز | ٥٠/٦/٢٦ | حسين عبد فلاني |
| ١٤. | محى الدين علي محمد | ٦٧/٢٢٧/١١٤ | علي شرقي خلف |
| ١٥. | علي محمد عمر | ٥٠/٢٤١/١٤ | يوسف عبدالحميد عمر |
| ١٦. | رحمن كاكل علي | ٥٠/٢٢١/١٤ | مهدي عبدالساد مكرم |
| ١٧. | محمد محىالدين فتاح | ٥٣/١٢٧/٤ | فروز مصطفى محمد |
| ١٨. | عثمان سليمان محمد | ٥٣/١٠/١ | عماد محمد حمد حسن |
| ١٩. | احمد حسن حسين | | كريم حسن اسعد |
| ٢٠. | محمد احمد حسن | ٥٠/٢٧/٣٩ | حويز محمد رسن |
| ٢١. | محمد صالح قادر | ٥٢/٧/٧ | كامل عبدالحسين حمادي |
| ٢٢. | عثمان امين عبدالرحمن | ٥٣/٢٧/١ | فليح محمد حسن |
| ٢٣. | نورالدين عبدالله مصطفى | ٤/١٠٠/٣٣١ | حبيب لوقا حنا |
| ٢٤. | حسين قادر محمد | ٥٠/٣١ | حكيم رؤوف جاسم |
| ٢٥. | كمال علي عبدالله | ٥٢/٤٧٣ | عبدالصاحب جبار مظلوم |
| ٢٦. | مجيد حميد احمد | ٥٠/٢٨٩ | فاضل قحطان نايف |
| ٢٧. | نوري محمد محمود | ٥٠/٢٨٦٩ | خليل ابراهيم حسين |
| ٢٨. | امين احمد رضا | ٤٨ بولاق | محمد حسون معين |
| ٢٩. | شرف الدين مصطفى محمد | ٥٢/٨٤٠/٧ | عماد كريم عبدالسادة |

بەپێی بڕیاری ژمارە ٤٤٢ی ٢٠٠١ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) عەرەبی حەویجە، وەکو عەرەبی ناوچەکانی تری عێراق بۆیان هەبوو بێنە شاری کەرکوك و خەڵاتی عەرەبی هاوردە (المستفيدين) یا پێدەدرا، بەڵام لەم دواییەدا ڕژێم هاتنی ئەوانی بۆ کەرکوك قەدەغە کرد نەوەکو ببێتە هۆی کەم بوونەوەی ڕێژەی عەرەب لەناوچەی حەویجەو دەوروبەریدا، کە پێشووتر حەویجەی بەعەرەبکردووە[119].

## ٦-بەعەرەبکردنی خوێندن:

ڕژێمی فاشی عێراقی هەر بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان پەنای بردۆتە بەر سیاسەتێکی تر ئەویش قەدەغەکردنی خوێندن بەزمانی کوردییە، لەدوای ساڵی ١٩٩١ەوە، وردە وردە هەوڵیدا خوێندن بەزمانی کوردی لەقوتابخانەکان نەهێڵێت، سەرەتا لە کەرکوکەوە دەستی پێکردو خوێندنی کوردی لە هیچ قوتابخانەیەکدا نەهێشت و، پاشان ئەمەی لەشارو شارۆچکەکانی تری ژێر دەسەڵاتیدا جێبەجێ کردو دوا جار لەساڵی خوێندنی (٢٠٠٠-٢٠٠١)دا خوێندنی کوردی لەقوتابخانەکانی ناو شاری مەخموریش قەدەغە کردو لەتەواوی قوتابخانەکاندا خوێندنی عەرەبی سەپاندە سەر خوێندەڤانانی کوردو لەخوێندن بەزمانی دایك بێبەشی کردن، شایانی باسە پرسی قەدەغە کردنی خوێندن بەزمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵی ١٩٨٩و سەرەتا بەبڕیاری ژمارە ٦٣٢ لە ١٩٨٩/١٠/٧ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) ڕژێم دەیویست زمانی کوردی بخاتە پەراوێزەوە، وەك لەبڕگەی یەکەمی ئەو بڕیارەدا هاتووە قوتابی بەدەرنەچوو (راسب) حساب ناکرێت ئەگەر هاتوو لەوانەی زمانی کوردی دەرنەچوو، ئەم بڕیارەش هەموو ئەو قوتابخانانە دەکرێتەوە کە زمانی کوردی تێدا دەخوێنرێت. ئەمەش زیاتر خستنە لاوەی زمانی کوردیو خوێندنی کوردییەو ئەگەر سەیری بکەین لەبڕگەی دووەمی هەر ئەو بڕیارەدا هاتووە کە (کار بەهیچ دەقێکی تری پێچەوانەی ئەو دەقە ناکرێت)[120]. ئەوەش بڕیارێکی یەکلایی کەرەوەیە بۆ نەخوێندنی زمانی کوردیو کار کردن بۆ قەدەغە کردنی خوێندن بەزمانی کوردی، کە ئێستا ئەوەش لەلایەن

---

١١٩- گۆڤاری گوڵان، ژمارە ٣٩٩ی ٢/٩/٢٠٠٢. . . ل٥.

١٢٠- جريدة الوقائع العراقية، العدد ٣٢٧٨، اليوم ٢٣/١٠/١٩٨٩.

دەزگاکانی رژێمی عێراق جێبەجێ کراوەو خوێندن بەزمانی کوردی لەسەرتاسەری عێراقدا قەدەغە کراوە.

## ٧-قەدەغە کردنی ناونانی منداڵانی کورد بەناوی کوردی:

رژێمی داگیرکەری عێراق بەهەموو شێوەیەك هەوڵدەدات بۆ نەهێشتنی کوردو سڕینەوەی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی، ئەوەتە هەر بەمەبەستی بەعەرەبکردن بڕیاریداوە کاتێ کە منداڵانی کورد لەدایك دەبن نابێ بەناوی کوردی ناوبنرێن. بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەکیان لەپیاوانی خۆیان پێکهێناوە، کە ئەمانەن:

أ- العقيد الحقوقي قاسم محمد عطية- مدير جنسية التأميم.

ب- المقدم صالح نجم غناوي- مدير شؤون احوال المدنية في التأميم.

ج- الدكتور سعدون الجبوري- اختصاص طب النفسي.

د- الشيخ اجود جهاد العزاوي- ممثل أوقاف كركوك[١٢١].

ئەوانە هەر چواریان عەرەبن و ئەندامی حزبی بەعسن و رۆژی ٢٠٠٢/٤/٢٢ لەکەرکوك کۆبوونەتەوە بۆ گۆڕینی ناوی کوردیو قەدەغەکردنی ناونانی منداڵانی کورد بەناوی کوردیو، لەکۆتایی کۆبوونەوەکە نووسراوێکیان بۆ (مديرية الجنسية العامة) لەبەغدا، بەرز کردۆتەوەو داوایان کردووە کە منداڵانی کورد بەناوی کوردی ناونەنرێن و هەوڵیشبدرێت خەڵك هانبدرێت بۆ گۆڕینی ناوی غەیرە عەرەبی بۆ ناوی عەرەبی، کە ئەمەش هەر کورد دەگرێتەوە.

پاش هەوڵەکانی ئەو لیژنەیە بڕیارێك لەدیوانی سەرۆکایەتی (ديوان الرئاسة) دەرچووەو بۆ فەرمانگەکانی (نفوس) نێرراوەو لەفەرمانگەی نفوسی کەرکوك هەڵواسراوەو بەپێی ئەو بڕیارە نابێت کوردو تورکمان ناوی کوردیو تورکمانی لەمنداڵەکانیان بنێن. ناوکە سادەترین مافی هەر کەسێکە، کە منداڵەکەی بە چ ناوێك ناوبنێت، رژێمی عێراق ئەوەشی قەدەغە کردووە.

ئەو خاڵانەی لەپێشەوەدا باسمانکردن شێوازەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان بوو لەلایەن رژێمی داگیرکەری عێراق کە لە ١٩٩١ەوە تائێستا پێڕەوی دەکات و بەردەوامە لەسەری. سەرەڕای ئەو خاڵانەش زۆر جار رژێم پەنا دەباتە بەر شێوازی تری وەك

---

١٢١- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢٨٢٠ی ٢٠٠٢/٧/٢٩.

شەڕی دەروونی، وەك ئەوەی ناهێڵێت کورد هیچ شتێکی بەناو بێت و نایەڵێت خانووەکەی چاکبکاتەوەو نایەڵێت بەشداری بەکرێ گرتنی دوکان و شوێنی کار کردن بکات و لەهەموو شتێك دووری دەخاتەوە، بۆ ئەوەی بێئومێدی بکات و ناچاری بکات خۆی کۆچ بکات و ژێر دەسەڵاتی ئەو ڕژێمە بەجێبهێڵێت!! هەروەها ماوەیەکی زۆرە پەنا دەباتە بەر گۆڕینی دیموگرافیای کوردستان و شوێنەوارو قەڵا کۆنەکانی کوردستان دەرووخێنێت و هەندێ جار لەسەر شێوازی بیناسازی عەرەبی ئیسلامی چاکیان دەکاتەوە بۆ ئەوەی وای نیشان بدات کە ئەو شوێنە بەشێکە لەدیرۆك و کەلەپووری عەرەب، بۆ ئەم مەبەستەش ئەگەر سەیر بکەین ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەقەڵای هەولێر کراوە دەچێتە ئەو خانەیەوە، هەروەها ڕووخاندنی قەڵای کەرکوکیش بەهەمان مەبەستە کە ماوەیەکە دەستی داوەتە ڕووخاندن و شێواندنی قەڵاکە. خاپوور کردنی گوندەکانی کوردستان و دروستکردنی (مستوطنات)ی عەرەبی لەشوێنیان ئەوەش هەر دەچێتەوە خانەی گۆڕینی دیموگرافیای کوردستان، هەروەها ڕژێمی عێراق لەم ماوەیەی دواییدا دەستی کردووە بەوشککردن و بڕینی ئەو جۆگە ئاوانەی کە لەدیجلەوە ڕاکێشراون و دەیان گوندی عەشیرەتە عەرەبەکانی باشووری عێراق ئاو دەدەن، بڕینی ئەو جۆگە ئاوانەش بۆتە هۆی دروستکردنی وشکایی و بێ ئاوییەکی زۆر لەباشووری عێراقدا، جگە لەوە بەشی کیمیاوی تۆوی چاندنیش بەجوتیارانی عەرەبی باشوور نادات، لەهەمان کاتدا هەموو ئاسانکارییەك پێشکەش بەعەرەبە هێنراوەکانی کوردستان دەکات[122]. ڕژێم لەم ڕێیەوە ڕێگە خۆش دەکات بۆ هێنانی زۆرترین ژمارەی عەرەب بۆ کوردستان و ژمارەیەکی زۆریشی لەو عەرەبانەی باشوور کە ئاوی لەسەر بڕیون هێناوەتە کەرکوك و دەوروبەری و نیشتەجێی کردوون. بەم شێوەیە ڕژێمی داگیرکەری عێراق لەکاتی دامەزراندنی عێراقەوە تائێستا درێژە بە بەعەرەبکردنی کوردستان دەدات. بڕوانە نەخشەی ژمارە (١). کە قۆناغەکانی بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان لەلایەن ڕژێمە یەك لەدوایەکەکانی عێراق دەردەخات.

---

١٢٢- گۆڤاری گوڵان، ژمارە ٤٠١ی ٢٦/٩/٢٠٠٢... ل٥.

# بەشی سێیەم

# بەعەرەبکردنی ڕۆژئاوای کوردستان
# (کوردستانی بن دەستی سوریا)

بەشێك لەخاکی کوردستان (ڕۆژئاوای کوردستان) کەوتۆتە بندەستی ڕژێمی داگیرکەری سوریا، کەولاتێکی عەرەبییە، لەکاتی لکاندنی ئەم بەشەی کوردستان بەسوریاوە، تائێستا بەردەوام پیلانەکانی بەعەرەبکردنی لەسەر جێبەجێ دەکرێت و، سوریا بەردەوام ئینکاری بوونی خاکی کورد لەبن دەستی سوریادا دەکات و دان بەبوونی نەتەوەی کوردیش لەچوارچێوەی سنووری دەستکردی سوریادا نانێ.

لەساڵی ١٩٤٦دا دوای کۆتایی هاتنی مانداتی فەرەنسا لەسوریا، کە سوریا سەربەخۆی خۆی ڕاگەیاند، ئیتر کەوتە جێبەجێکردنی سیاسەتی بەدناوی (پشتێنی عەرەبی)و بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکانی سەر سنووری (تورکیا- سوریا)و (عێراق- سوریا)، (ئەم سیاسەتە دوو پرۆسەی پێ ئەنجام دەدرا، یەکەم تەعریب کردنی ناوچە سنوورییەکان و ڕاگواستنی کورد، دووەمیش دوور خستنەوەی کوردی دیوی سوریا لەکوردی ناوچە کوردییەکانی دیوی تورکیاو عێراق)[١٢٣] سوریا لەو ڕێگەیەوە هەوڵی دەدا دوورایی مێژوویی و جوگرافی و کۆمەڵایەتی لەنێوان پارچەکانی کوردستاندا نەهێڵێ و بوونی کوردیش لەدیوی خۆی بسڕێتەوەو (بەو سیاسەتەی پلانی نەهێشتنی کوردی لە بەشە داگیرکراوەکەی کوردستانی سوریادا کێشاوە)[١٢٤]. ڕژێمی داگیرکەری سوریا لەساڵی ١٩٥٩دا کەوتە ڕاوەدوونان و گرتنی

---

١٢٣- د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد... ل١٠٢.

١٢٤- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی... ل٧.

ئەو کوردانەی کە دەیانویست لەبواری سیاسیدا کار بکەن و ٣٠ کەسی لەرێبەرانی سیاسی رۆژئاوای کوردستان گرت و لەزینداني نان[١٢٥]. بۆ کەمکردنەوەی رێژەی کورد لەسوریادا، رژێم پەنای بردە بەر سەرژمێرییەکی ناڕەوا کە پێشووتر فەرمانی یاسایی ژمارە ٩٣ی ١٩٦٢/٨/٢٣ی بۆ دەرکردبوو و، لە ١٩٦٢/١٠/٥دا کاری پێکردو لەو رۆژەدا دەستی بەسەر ژمێرکردنی پارێزگای حەسەکە کردو لەئەنجامدا زیاتر لە (٢٠٠٠٠٠) دووسەد هەزار کوردی بێ ناسنامەی سوری هێشتەوەو بەبیانی تۆماری کردن[١٢٦] و، تائێستاش ئەو خەڵکە بێ ناسنامە ماون، کەئێستا ژمارەیان دەگاتە (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار کەس[١٢٧]. هەرچەندە لەبرگەی (ج)ی ماددەی (٢)ی یاسای رەگەزنامەی سوری ژمارە ٢٧٦ی ساڵی ١٩٦٩دا هاتووە کە ناسنامەی سوری دەدرێتە ئەو کەسانەش کە دایك و باوکیان دیارنیەو بێ رەگەزنامەن و رەگەزنامەیان نیە هەتا ئەگەر بیژوویش بن بەڵام لەسوریادا لەدایك بوو بن[١٢٨]. کەچی ئەم یاسایە کورد ناگرێتەوەو تەنها بۆ عەرەبی سوریایە. ئەو کێشەی (بێ ناسنامە)ییە یەکێکە لەوکێشانەی کە تائێستا بۆتە هۆی نیگەرانییەکی زۆر بۆ کورد لەرۆژئاوای کوردستاندا[١٢٩] لەلایەن کوردەوە کاری زۆر دەکرێ بۆ هەڵگرتنی ئەو یاسا ناڕەوایەو دانەوەی ناسنامە بەکوردو، پاڵەپەستۆی زۆر خراوەتە سەر دەسەڵاتدارانی سوریا لەم بوارەدا، بەڵام تائێستا رژێمی سوریا هیچ وەڵامێکی لەم بارەیەوە نییەو سوورە لەسەر هەڵوێستی پێشووی. دوا هەوڵ لەم بوارەدا ئەوەبوو کۆمەڵێ پارێزەری کورد یاداشتنامەیەکیان دا کۆنگرەی گشتی سەندیکای پارێزەرانی سوریا، کە لە ٢٠-٢٠٠٢/٤/٢١ دا لە (دیرالزور) بەستراو ژمارەیەکی زۆریش لەدەسەڵاتدارانی سوریا تێیدا بەشداربوون[١٣٠]. بەفراوانیش یاداشتنامەکەیان دابەشی سەر بەشدارانی کۆنگرەکە کرد.

١٢٥- د سعد ناجي جواد، الأقلية الكردية في سوريا. . . ص١٨.

١٢٦- جريدة الوحدة، العدد ١٠٧ آيار ٢٠٠٢.

١٢٧- جريدة التجمع، العدد ٩ شباط ٢٠٠١.

١٢٨- جريدة الوحدة، العدد ١٠٧ آيار ٢٠٠٢.

١٢٩- د سعد ناجي جواد، الأقلية الكردية في سوريا. . . ص١٨.

١٣٠- جريدة الوحدة، العدد ١٠٧ آيار ٢٠٠٢.

بۆ زیاتر بەعەرەبکردنی رۆژئاوای کوردستان و دەستبەسەر داگرتنی خاکی کوردان رژێمی سوریا لەسالآنی ١٩٦٢و ١٩٦٣دا درێژەیدا بەدروستکردنی (حزام الاخضر) کە بە (پشتێنەی عەرەبی ناسراوەو درێژییەکەی ٣٥٠کم و پانیەکەشی ١٠-١٥کم ەو کەوتۆتە سەر سنووری (سوریا- عێراق)و (سوریا- تورکیا) بەدرێژی ئەو سنووره کوردی لەشوێنی باب و باپیرانیان دەرکردو عەرەبی هێنا شوێنیان، دۆزینەوەی نەوت لەناوچەی جەزیرە هۆکارێك بوو بۆ راگواستنی کورد لەو ناوچانەو هێنانی عەرەب بۆ شوێنیان[١٣١]. ئەوەش هەوڵێك بوو بۆ لەناوبردنی گەلی کورد (لەئەنجامی ئەوە (٣٣٢) گوندی کورد نشین تەهجیر کران و لەشوێنی داو بەناوی دامەزراندنی باغ و بێستان، عارەبەکانی تێدا نیشتەجێ کران و ناوچەکە تەعریب کرا)[١٣٢] ئەم سیاسەتە درێژەی هەبوو هەر ماوەی لەژێر ناوێکدا. لەسالآنی ١٩٦٦و ١٩٦٧و ١٩٦٨و ١٩٦٩دا دەستکرا بەدەستبەسەر داگرتنی زەویەو زاری جوتیارانی کوردو پاشان زەوییەکان درانە خێڵە عەرەبە هێنراوەکان، ئەم سیاسەتەش لەژێر پەردەی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی جێبەجێکرا[١٣٣]. پاشتر لەم شالآوەدا (سالآنی ١٩٧٥-١٩٧٨ رژێمی سوریا ١٠٠,٠٠٠ سەد هەزار خێزانی عەرەبی لەغەمرە نیشتەجێ کرد. لەگەڵ راگواستن و تەعریب و قەدەغەکردنی زمان و کلتوری کوردیدا لەسوریا ناوی گوندو ناوچەو شارەکان لەکوردییەوە کراونەتە عەرەبی)[١٣٤]. ئێستاش رژێمی سوریا کار بۆ ئەوە دەکات و، ٤٢ گوندی لەرۆژهەلآت و رۆژئاوای قامشلۆ داوەتە عەرەب[١٣٥]و، ٤١ (مستوطنة)ی بۆ عەشیرەتە عەرەبە کۆچەرەکانی دەوروبەری حەلەب و (الرقە) لەنزیك قامشلۆ سەر سنووری نێوان عێراق- سوریاو بەشێکی سەر سنووری نێوان سوریا- تورکیا دروستکردووە[١٣٦]، کە ئەمانە ناوەکانیانن:

---

١٣١- د.سعد ناجي جواد، الأقلية الكردية في سوريا. . . ص١٨-١٩

١٣٢- هەژار عەزیز سورمێ، کوردو جینۆسایدو ئیبادەکردن. . . ل٣١.

١٣٣- يكيتي، العدد ٦٠ نيسان ٢٠٠٠ . . . ل٤.

١٣٤- د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد. . . ل١١٤.

١٣٥- جريدة الوحدة، العدد ١٠٧ آيار ٢٠٠٢.

١٣٦-الجبهة الديمقراطية الكردية في سوريا، البرنامج السياسي والنظام الداخلي. . . ص١.

| ١-عين الخضرة | ١٥-قحطانية الغمر | ٢٩-الاسدية |
|---|---|---|
| ٢-تل الصدق | ١٦-حلوة الغمر | ٣٠-أم عظام |
| ٣-الصحية | ١٧-تنورية الغمر | ٣١-أم انفرة |
| ٤-مصطفاوية الغمر | ١٨-أم الفرسان | ٣٢-المتنبي |
| ٥-تل اعور الغمر | ١٩-هنادى (هيمو الغمر) | ٣٣-تل الأرقم |
| ٦-حمراء الغمر | ٢٠-أم الربيع | ٣٤-العنادية |
| ٧-تل علو رقم ١ | ٢١-الثورة | ٣٥-الدهماء |
| ٨-تل علو رقم ٢ | ٢٢-بهيرة | ٣٦-الراوية |
| ٩-جوادية الغمر | ٢٣-الحاتمية | ٣٧-الهنادية |
| ١٠-شبك الغمر | ٢٤-الجابرية | ٣٨-تل حضارة جنوبي |
| ١١-الغمر | ٢٥-تل | ٣٩-تل حضارة شمالي |
| ١٢-معشوق الغمر | ٢٦-القنيطرة | ٤٠-برقة |
| ١٣-المنازرة | ٢٧-القيروان | ٤١-تشرين |
| ١٤-الحرمون | ٢٨-ظهر العرب | |

سیاسەتی راگواستنی کوردو بەعەرەبکردنی کوردستان لەلایەن عەرەبێکی شۆڤێنی و فاشی سوریا بەناوی (ملازم اول محمد طلب هلال)ەوە نەخشەی بۆ کێشراوەو، وەك پرۆژەیەك پێشکەش بەدەسەلاتی سوریا کراوە تا لێی وردبێتەوەو بریاری لەسەر بدات، پاشان رژێمی فاشی سوریاش بریاری لەسەر پرۆژەکەی (هلال) داوەو کاری پێکردووە. پرۆژەکە (راستتر دەتوانین بلێین پیلاننامەکە) لە (١٢) خاڵی سەرەکی پێکهاتووەو زۆر بەوردی جەختی کردۆتەوە سەر جێبەجێکردنی ئەو خاڵانەوەو بەدەسەلاتی سوریا رادەگەیەنێت، ئەگەر ئەو خاڵانە جێبەجێ بکات چارەسەری کێشەیەکی گەورە دەکات، ئەو پیلاننامەیە لەسەر بنچینەی (بەزۆر راگواستن، دەستبەسەر داگرتنی زەوی، برسیکردن، نیشتەجێکردنی عەرەب لەشوێنی کوردان، لێ سەندنەوەی ناسنامە، داخستنی دەرگای کارکردن، پروپاگەندەو ناوزڕاندنی کورد، تێکبەردانی کورد، قەدەغەکردنی زمان و کلتوری کوردی، دوور خستنەوەی کورد لەدەنگدان و خۆپالاوتن و..)[١٣٧] وەستاوە. رژێمی سوریاش ئەو

١٣٧- ملازم اول محمد طلب هلال، دراسة عن محافظة الجزيرة. . . ص٦٩-٧٠.

هەنگاوانەو گەلێ هەنگاوی تری ناوە بۆ نەهێشتنی بوونی کورد لەرۆژئاوای کوردستاندا.

رژێمی سوریا تائێستاش دان بەبوونی کوردو خاکی کوردستان لەرۆژئاوای کوردستاندا نانێ‌و دەستەواژەی (الاكراد في سوريا) لەنووسراوە رەسمیەکانی خۆی بەکار دەهێنێت و کورد وەکو بیانی و میوان دادەنێ‌و هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا دەکات، سیاسەتی ئینکاری بوونی کورد لەلایەن سوریا، لەرووی زانستی و ئەکادیمش کاری بۆ دەکرێ‌و زۆربەی نووسین و لێکۆڵینەوەکانیان بۆ پشتگوێ خستن و سرینەوەی بوونی کوردو شوێنە مێژووییەکانە، هەروەها هەوڵدەدەن مێژووی کۆنترین شوێنەوارە کوردییەکان بگۆڕن و بیکەن بەهی عەرەب و، دان بەهیچ شتێك دانانرێ کە کورد کردبێتی و هی کورد بێت[138].

رژێمی سوریا جگە لەنیشتەجێکردنی عەرەبی سوری لەناوچە کوردییەکان لەم ساڵانەی دوایدا کاری دەکرد کەوا (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار ماڵە عەرەبی فەلەستینی کە ژمارەی ئەندامانی خێزانیان دەگاتە (٥٠٠٠٠٠) نیو ملیۆن کەس لەپارێزگای حەسەکەدا نیشتەجێبکات[139]. سوریا پێشتر بریاری خۆی دایە کە دەست بەسەر خاك و خەڵکی رۆژئاوای کوردستاندا بگرێت و خاکی کوردستان بە بەشێکی جیانەکراوەی سوریا بزانێت، ئەمەشی لەدەستوری خۆیدا جێگیر کردووەو لەبرگەی یەکەمی ماددەی یەکی دەستووری سوریادا هاتووە (بەهیچ شێوەیەك دەستبەرداری پارچەیەك لەخاکی سوریا نابین)[140]و، لەبرگەی دووەمی هەمان ماددەدا هاتووە کە (هەرێمی سوریای عەرەبی بەشێکە لەنیشتمانی عەرەب)[141]و لەبرگەی سێیەمیش دا هاتووە (گەلی سوریا بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب)[142]. ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە دەستووری سوریا ئەوا ئەوکاتە شۆڤێنیەت و فاشییەتی ئەو رژێمەمان بۆ دەردەکەوێت، سەیرکەن لەماددەی (٢١)ی دەستووری سوریا هاتووە (سیستەمی

---

١٣٨- جريدة الجبهة، العدد ٨ كانون الثاني ٢٠٠٢.

١٣٩- صلاح بدرالدين، غرب كردستان. . . ص١٦٥.

١٤٠- دستور الجمهورية العربية السورية، . . ص٨.

١٤١- هەمان سەرچاوە. . .

١٤٢- هەمان سەرچاوە. . .

پــەروەردەو رۆشــنبیری ئامــانجی دروســتکردنی نەوەیــەکی عــەرەبی نەتــەوەیی سۆشیالیستی زانستییە..)[١٤٣] هەر ئەو دەستوورە جگە لەزمانی عەرەبی رێگەنادات بەهیچ زمانێکی تر خوێندن و نووسین لەقوتابخانەکاندا هەبێت، وەك لەماددەی (٤)دا هاتووە (زمانی عەرەبی زمانی رەسمییە)[١٤٤]. پارتی بەعس کە پارتێکی شۆڤێنیو فاشییەو دژی هەموو نەتەوەیەکی ترە رێبەرایەتی ئەو وڵاتە دەکات و هەموو کارێکی ئەو وڵاتە لەدەستی ئەودایەو لەدەستووریشدا ئەوە چەسپاوە وەك لەمادەی (٨)دا هاتووە (پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالستی، پارتی رێبەرە لەنێو کۆمەڵگاو دەوڵەتدا..)[١٤٥]. رژێمی سوریا بەم شێوەیە خاکی رۆژئاوای کوردستان بەنیشتمانی عەرەبیو خەڵکەکەشی بە بەشێك لەنەتەوەی عەرەب دادەنێو دەیەوێ کورد لەبۆتەی عەرەبیدا بتوێنێتەوە.

رژێمی سوریا، تارادەیەك سوودی لەسیاسەتی ئیسرائیل بەرامبەر عەرەب وەرگرتووەو ئیسرائیل چی بەرامبەر عەرەبەکانی ژێر دەسەڵاتی کردووە، سوریاش هەمان سیاسەتی بەزیاترەوە لەسەر کوردان پراکتیك کردووە. هەر سەردەمەو پیلانی تایبەتی بۆ بەعەرەبکردنی رۆژئاوای کوردستان داڕشتووەو هەموو توانایەکی دەوڵەتیشی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووەو، لەرێی دەزگا پۆلیسییەکانی پیلانەکانی جێبەجێ کردووە.

بەعەرەبکردنی رۆژئاوای کوردستان لەسەرەتای شەستەکانەوە زۆر بەچڕی تائێستا لەلایەن سوریاوە کاری لەسەر دەکرێو، سەرەتا لەپارێزگای حەسەکە دەستی پێکردو دواتر درێژ بۆوەو ناوچەی کۆبانێو ناوچەی عفرینی گرتەوەو پاشتر جارێکی تر جزیرەی گرتەوە[١٤٦]. حکومەتی سوریا بۆ دەرکردنی جوتیارانی کورد لەگوندەکانیان پەنای بردۆتە بەر بەکارهێنانی سوپاش، لەساڵی ١٩٦٧دا سوپای سوریا هێرشی کردە سەر گوندە کوردییەکانی سەر سنوور بەمەبەستی دەرپەڕاندنیان و هێنانی عەرەب بۆ شوێنیان و بەسەدان خەڵکیان لەو

١٤٣- هەمان سەرچاوە... ص١٢.

١٤٤- هەمان سەرچاوە... ص٩.

١٤٥- هەمان سەرچاوە...

١٤٦- صلاح بدرالدین، غرب کردستان... ص٢١٠.

گوندانـــه گـرت و كوشــــت[147]. لەگـەلێك شـوێندا سـوريا لەتەنيـشت گونـدی كـوردان (مـستوطنات)ی عـەرەبی بـۆ عـەرەبان دروسـتكردووەو ئـاوو كارەبـای بـۆ رادەكێـشان و بـۆ گونـدە كوردييەكـەی رانەدەكێـشاو لەهـەموو خزمەتگوزارييـەكانی بێبەش دەكردن[148].

بەعــەرەبكردنی كوردســـتان نـــاوی كـــەس و گونـــدو ناوچـــەو شارەكانيـــشی گرتۆتــەوەو[149]، سـوريا پـەنای بردۆتـە بـەر گـۆڕينی نـاوی گونـدو شـوێن و شـارە كوردييـــەكان و هـــەمووی كـــردوون بـــەناوی عـــەرەبی[150]. رژێمـــی ســـوريا ئـــەو گۆڕانكارييانەی هەر هەموو بەبڕيارو لەچوارچێوەيەكی ياسايی شۆڤێنيانە كە خۆی دايڕشـتووە جێبـەجێ كـردووەو ئـەو شـالاوەش تـەواوی ناوچـەكانی رۆژئـاوای كوردستانی گرتۆتەوە، هەڤبەندی ديموكراتی كورد لەسوريا لەناميلكەيەكدا بەناوی (تعريب القرى والبلدات الكردية) هەموو ئەو گۆڕانكارييانەی تۆمار كردووەو خستۆتە ڕوو، دەقـی بڕيارەكـانی رژێمـی سـوريا بـۆ ئـەو گۆڕانكارييانـەو ناوچـەو گونـدەكان هەمووی تۆماركراون و ناوی گوندە كوردييەكان پێشوو چی بوونـەو بەچيش گـۆڕاون بۆ عەرەبی ناوەكان هەموويان لەبەرامبەريەكدا نووسراون، گۆڤاری (سەرخۆبوون)يـش كە گۆڤارێكی هزری سياسی وەرزييەو YNDK دەری دەكات لەژمارەكانی (٤و ٥و ٦)ی خۆيدا دەقی ئەو ناميلكەيەی كردۆتە كوردیو بلاَوی كردۆتـەوە. كـۆی ئـەو گوندانـەی كـە ناويـان گـۆڕاوەو لەناميلكەكـەدا تۆمـاركراون بـريتين لـە (٧١٦) گونـد لەتـەواوی ناوچـەكانی رۆژئـاوای كوردسـتاندا. بێگومـان پێشتر ناوەكـان هـەموو كـوردی بوونـە، لەبـەر ئـەوەی هـەزاران سـاڵە كـورد لـەو شـوێنە لەسـەر خـاكی خـۆی دەژیو خـۆی شارستانيەتی ناوچـەكەی ئاڤاكردووە. (ئاشـكرايە كـە گـەلی كوردمـان لەسـوريا لەسـەر ئـــەو خاكـــە مێژوويـــەی خۆيـــدا دەژی كـــە شـــوێنەوارە سروشـــتیو مرۆيـــیو شارستانييەكانی نـاوی كوردييـان لێيـەو، وەك چـۆن خەڵكـەكانی بـەو ناوانـە ناسـراون ئـاواش گونـدو شـارەكانی بـەو ناوانـە ناسـراون و بوونەتـە بەشـێكی جيانـەكراوە

١٤٧- جواد ملا- كردستان والكرد. . . ص٨١.

١٤٨- هەمان سەرچاوە. . .

١٤٩- صلاح بدرالدين، هەمان سەرچاوە.

١٥٠- جواد ملا، هەمان سەرچاوە. . . ص٨٣.

لەمێژووی ناوچەکە)[151] ئەو گۆڕانکارییانە دەچنە خانەی گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان و کاریگەری زۆر نێگەتیڤانەشیان کردۆتە سەر هەستی مرۆڤی کورد (سیاسەتی بەعەرەبکردن لەو سالأنەی دواییدا زۆر زیاتر پەرەی سەندووەو گەیشتۆتە سەرجەم ناوچە کوردییەکان و ناوە کوردییە دێرینەکان بەناوی عەرەبی دەگۆڕیێو، درزێکی گەورەی خستۆتە دیواری پەیوەندی کوردی- عەرەبیو، هەست بەماف خوراویو خۆ بەنامۆ بوونێکی زۆریشی لای مرۆڤی کورد دروستکردووە، لەبەر ئەوەی لای مرۆڤی کورد ناوی گوندەکەی ناسنامەو مێژوو و رەسەنایەتییە)[152]. لەم دواییەدا شۆڤێنیەتی سوریا گەیشتۆتە ئەو رادەیەی ناوی کوردیشی قەدەغە کردووە (مەترسییەکانی ئەو سیاسەتە لەوەدایە گەیشتۆتە رادەیەك لێناگەرێن تازە لەدایك بووە کوردەکان ناوی کوردییان لێ بنرێت)[153]. شایانی باسە ئەو سیاسەتە ئێستا لەلایەن رژێمی عێراق و رژێمی تورکیاش پیادە دەکرێت.

هەر بەمەبەستی بەعەرەبکردنی کوردستان و قڕکردنی کورد، رژێمی سوریا پەنای بردۆتە بەر کۆمەڵکوژی نەتەوەکەمان لەرۆژئاوای کوردستان و لە ١٩٦٠/١١/٣١ (٣٨٠) منداڵ و هەرزەکاری کوردی لەسینەمای ئامودەدا سوتاندو لە ١٩٩٣/٣/٢٣شدا (٧٢) زیندانی سیاسی کوردی لەبەندیخانەی حەسەکەدا سووتاند[154]. هەروەها گرتن و راوەدوونانی کورد لەلایەن سوریاوە سیاسەتێکی ترە بۆ هەراسانکردنی نەتەوەکەمان و ئەو سیاسەتەش بەردەوام کاری پێدەکرێو درێژەی هەیە، بۆ نموونە لەساڵی ١٩٧٣و ١٩٧٤و ١٩٧٥دا کۆمەڵێ خەڵکی شۆڕشگێڕی کوردی گرت و بێ دادگایی کردن هەندێکیانی (٧) ساڵ زیندانی کرد[155].

شاڵاوی گرتن و راوەدوونان گەیشتۆتە منداڵانی کوردیش، ١٩٨٨/١٢/١٥ رژێمی سوریا (١٧) منداڵی کوردی لەقوتابخانەکانی (الطلائع)و (تشرين) لەشاری قامشلۆ بەتاوانی ئەوەی کە ئالأی کوردستانیان لەسەر ئەو دوو قوتابخانەیەدا بەرز کردۆتەوە

---

١٥١- التحالف الديمقراطي الكردي في سوريا، تعريب القرى والبلدات الكردية. . . ص٣.

١٥٢- هەمان سەرچاوە. . . ص٤.

١٥٣- هەمان سەرچاوە. . .

١٥٤-جواد ملا، كردستان والكرد. . . ص١٨٢.

١٥٥- يكيتي، العدد ٦٠ نيسان ٢٠٠٠.

گرت[156] شالآوی گرتن و راوەدوونانی کورد لەلایەن رژێمی سوریاوە تائێستاش بەردەوامەو درێژەی هەیە، بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (٦٤، ٦٥، ٦٦). رژێمی سوریا سەرەڕای ئەوانەی کەباسمان کردن بەردەوام بەدوای شێوازی تازەدا دەگەڕێ بۆ دەرپەڕاندنی کورد لەسەر ماڵ و حاڵی خۆی، ئەوەتە ماوەیەکە کەوتۆتە هاندانی کورد بۆ ئەوەی بۆ ئەوروپا کۆچ بکەن و سوریا بەجێبهێڵن و لەم پێناوەشدا هەموو جۆرە ئاسانکارییەکیان پێشکەش دەکات[157]. رژێمی سوریا دەرگای کارکردنی لەکورد داخستووەو لەکۆمپانیاو کارگەکانی دەوڵەتدا دەریان دەکات و وەریان ناگرێت و داواکانیان ڕەت دەکاتەوە، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٦٧)و، لەشوێنی ئەواندا کرێکاری عەرەب دەهێنێ و کاریان پێدەکات و هاوکاریشیان دەکات بۆ نیشتەجێبوونیان لەناوچە کوردییەکاندا، ئەوەش دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی ڕێژەی دانیشتوانی عەرەب لەناوچە کوردییەکان دا. هەر بۆ بێزارکردنی کورد بەهاران بۆ نەهێشتنی گەشت و سەیرانی کوردان دەوریاتی ئەمن دەردەکەن بۆ ئەو شوێنانەو خەڵك بێزار دەکەن و سەیرانەکانیان لێ تێکدەدەن، بیانووشیان ئەوەیە کەوا پارتە کوردییەکان ئەو سەیران و گەشتانە ڕێکدەخەن و دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی هەستی نەتەوەیی کوردو ئەوەش هەڕەشەیە بۆ سەر ئاسایشی سوریا، ئەوەتە ئەمنی سوریا ڕۆژی ٢٠٠٢/٥/١٠ چەند تیپێکی هونەرو گۆرانی کوردیان کە بۆ سەیران خۆیان ئامادە دەکرد گرت. ئەو شێوازەی ئەمنی سوریا لەدیمەشق و تەواوی ناوچەکانی ڕۆژئاوای کوردستانیشدا پیادە دەکرێت[158] لەلایەکی ترەوە گوندە کوردییەکانیان بەتەواوی پشتگوێ خستووەو لەهەموو خزمەتگوزارییەك بێ بەشیان کردووەو چەندین قوتابخانەیان داخستووەو بیانوو دەدۆزنەوە بۆ دەرکردنی خوێندەڤانی کورد لەقوتابخانەکاندا[159].

رژێمی سوریا بەلێسەندنەوەی ناسنامە زولمێکی زۆر گەورەی لەگەڵ کورد کردو هیچ هۆکارێکی یاساییش نەبوو بۆ بێ ناسنامە هێشتنەوەی کوردان لە ڕۆژئاوای

---

١٥٦- صلاح بدرالدين، غرب كردستان. . . ص١٠٥.

١٥٧- جريدة الوحدة، العدد ١٠٦ نيسان ٢٠٠٢.

١٥٨- جريدة الوحدة ١٠٧ آيار ٢٠٠٢.

١٥٩- هەمان سەرچاوە.

کوردستاندا[١٦٠]. لێسەندنەوەی ناسنامە دەستدرێژییەکی توندبوو بۆ سەر بەها مرۆییەکان و بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر بەرەو دەرەوەی سوریا کۆچ بکات[١٦١]. ئەگەر سەیر بکەین دەبینین پرسی بێناسنامەکردنی کورد، مرۆڤی کوردی رووبەڕووی کۆمەڵێ گرفت کردۆتەوە، لەوانە ناتوانن خاوەندارێتی هیچ شتێك بکەن و یاسای سوریا رێگرە لەوەی کە خانوو، ئوتومبێل و شوێنی کارکردن و..تد بەناویان بکرێت، هەروەها ئەوانەی کە ناسنامەیان نییە لەزانکۆو پەیمانگاکان وەرناگیرێن و لەخوێندنی بالآدا بێبەش دەبن[١٦٢]. سەرەڕای ئەوە کاریان پێنادرێت و لەهیچ دام و دەزگایەکی دەوڵەتیشدا دانامەزرێن. لەکاتی چوونیان بۆ شارە گەورەکانی سوریا، لەکاتی مانەوەیان لەهوتێل و شوێنە گشتییەکاندا هەمان مامەڵەی خەڵکی بیانییان لەگەڵدا دەکرێت و،. لەهەمووی سەیرتر لەکاتی بێناسنامە هێشتنەوەی کورددا سەیردەکەین لەماڵێکدا باوك هاولآتیەو ناسنامەی هەیە بەلآم کوڕەکەی هاولآتی نییەو ناسنامەشی نییە، مێرد هاولآتیەو ناسنامەی هەیە بەلآم ژنەکەی هەونیەو، هەروەها لەماڵێکدا برایەك هاولآتییەو براکەی تر بیانییە[١٦٣]. ئەوەش ئەوپەڕی گاڵتەجاڕییەو دوورە لەهەموو بەها مرۆڤایەتییەکان. هەر چەندە یاسای سوریا ماف بەهەموو ئەو کەسانە دەدات کە (٥٠) پەنجا ساڵ لەسەر خاکی سوریا ژیابن ببنە خاوەن ناسنامەی سوری، بەلآم لەوەشدا کورد هاوێرکراوەو دوور خراوەتەوە[١٦٤]. لەهەمووشی سەیرتر ئەوانەی ناسنامەیان نییە لەدادگا ژنیان لێ مارە ناکرێت و هەروەها بەپێی یاسای ژمارە ٢٧٢ی ساڵی ١٩٦٩ نابێ ژن و ژنخوازی لەنێوان هاولآتیانی سوری و بێناسنامەکاندا هەبێت[١٦٥]. زۆر جاریش حکومەتی سوریا بەکوردە بێناسنامەکان دەڵێ (تورکە نیشتەجێکانی سوریا)[١٦٦]، بەهەمان شێوەی تورکیا کە بەکورد دەڵێ (تورکی شاخاوی) داگیرکەرانی کوردستان بۆ ئینکاری بوونی کوردو قڕکردنی سوود

---

١٦٠- جريدة التجمع، العدد ٧ ايلول ٢٠٠٠.

١٦١- جريدة التجمع، العدد ٩ شباط ٢٠٠١.

١٦٢- صلاح بدرالدين، غرب كردستان. . . ص١٠٣.

١٦٣- جريدة الجبهة، العدد ١٥ آب ٢٠٠٢.

١٦٤- هەمان سەرچاوە. . .

١٦٥- صلاح بدرالدين، غرب كردستان. . . ص١٩٤.

١٦٦- جواد ملا، كردستان والكرد. . . ص٨٢.

لەسیاسەتی یەکتر وەردەگرن. وەك ئەوەی کە سوریا سوودی لەسیاسەتی تورکیا لەم بارەو سیاسەتی عێراق بۆ (استیطان) کردنی عەرەب لەناوچە کوردییەکان و تەواوی شێوازەکانی تری عێراقی بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان وەرگرتووە.

سیاسەتی سوریا دەرهەق بەکورد لەلایەن زۆر کەس و لایەنەوە رەخنەی لێگیراوەو داوا کراوە کە سوریا دەستبەرداری ئەو سیاسەتە بێت لەبەرامبەر کورداندا. وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەراپۆرتی ساڵانەی خۆیدا لەساڵی ١٩٩٣دا، لەبەشی رەوشی مافی مرۆڤ لەسوریادا، چەند بەندێکی لەسەر سوریا تێدایەو ئاماژە بەوە دەکات کە سوریا دان بەبوونی کورد دانانێ و مافیان پێشێل دەکات و زمانی دایکیانی قەدەغە کردووەو دەستی داوەتە گۆڕینی ناوو دیمۆگرافیای ناوچە کوردییەکان و، هەروەها باسی لەوە کردووەکە دەیان گیراوی سیاسی کورد لەبەر هۆی نەتەوەییان لەزیندانەکانی سوریادا گیراون[١٦٧].

لەم ساڵانەی دواییدا سوریا بڕیارێکی تری دەرکردووە کە ئەگەر هاتوو هەر کوردێك ئەوانەی ناسنامەی سوورییان هەیە، ناسنامەکەی لێ ون بوو نابێ جارێکی تر ناسنامەی پێ بدرێتەوە، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٦٣. بەم شێوەیە سوریا بەردەوامە لەسەر بەعەرەبکردنی رۆژئاوای کوردستان و لەهەموو رووێکەوە هەوڵی سڕینەوەی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی کورد دەدات و دەیان شێوێنێ. (خاك، زمان، مێژوو، داب و نەریت، هەستی هاوبەش)ی کوردانی شێواندووەو بەردەوام هەوڵی نەهێشتنیان دەدات. هەموو رێیەکی لەپێشڤەچوونی کلتووری کوردی گرتووەو نایەڵێت گەشە بکات و پارێزگاری لەمانەوەی خۆی بکات، بەلام سەرەڕای ئەوەش نەتەوەکەمان لەرۆژئاوادا زۆر بوێرانە لەرووی ئەو سیاسەتە وەستاوەتەوەو تاڕادەیەکی باش توانیویەتی پارێزگاری بوون و مۆرکی نەتەوەیی خۆی بکات. کورد لەچوارچێوەی سنووری جوگرافی سوریادا بەدووەم نەتەوە دێت و ١٢٪ی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێکدەهێنێت[١٦٨]. کەچی لەتەواوی مافە نەتەوەیی و رۆشنبیری و مرۆییەکانی بێبەش کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا گەلی کورد لەرۆژئاوای کوردستاندا بەردەوام هەوڵدەدات و کێشەکەی دەخاتە بەردەم دەسەلاتی سوریاو

---

١٦٧- صلاح بدرالدين، غرب كردستان. . . ص١٤٩.

١٦٨- جريدة الجبهة، العدد ١٤ تموز ٢٠٠٢.

داوای چارەسەرییان لێ دەخوازێت، هەر چەند دەسەلاتی سوریا خۆی لەم پرسە دەدزێتەوە، بەلام کورد بەردەوامە لەسەر خەباتی خۆیدا. ئەوەتا دوا هەوڵی کوردان لەم بوارەدا ئەوەبوو کە کاتێ سەرۆکی سوریا بەشار ئەسەد لە ٢٠٠٢/٨/١٨ هاتە پارێزگای حەسەکە، شاندێکی بەرەی دیموکراتی کورد لەسوریا یاداشتێکیان ئامادە کردبوو کە داواکاری مافەکانی کوردی تێدا تۆمارکرابوو، چوون کە بچنە لای و ببینن و یاداشتەکەی بدەنێ، بەلام دەسەلاتدارانی سوریا نەیانهێشت و بوونە رێگر[١٦٩]، بروانە بەڵگەنامەی ژمارە (٦٨). پاشتر بەشێوازێکی تر یاداشتنامەکەیان پێگەیاندو زۆر بەفراوانیش لەناو جەماوەردا بلاویان کردەوەو، زۆربەی هەرە زۆری رۆژنامەو بلاوکراوەکانی پارتە کوردییەکانی رۆژئاواش یاداشتنامەکەیان بلاوکردەوە، لەگەڵ بەردەوامبوونی هەوڵی کورد بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی لەرۆژئاوای کوردستاندا، تائێستا ئەوەی تێبینی دەکرێ سوریا بەهیچ شێوەیەك هەوڵنادات رەوشی کوردان باش بکات و چارەسەری پرسی کورد بکات[١٧٠]. لەلایەکی ترەوە رۆشنبیرانی کورد بەردەوامن لەخەباتی خۆیان بۆ خوێندنی کوردی، بەلام رژێمی سوریا تائێستا نەهاتۆتە سەر ئەو باوەڕەی کەرێ بەخوێندن و نووسین بەزمانی کوردی بدات. رژێمی سوریا لەلایەك دژایەتی خوێندن و نووسین بەزمانی کوردی دەکات، کەچی لەلایەکی تر زانکۆی دیمەشق بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٠٢-٢٠٠٣) بڕیاری داوە بەشی زمانی یابانی لەزانکۆکەدا بکاتەوە[١٧١]. کە دەکرا بەشی زمانی کوردی لەزانکۆکە بکاتەوە.

---

١٦٩- جريدة صوت الاكراد، العدد ٣٣٣ آب ٢٠٠٢.

١٧٠- طريق الشعب، العدد ٣٢٨- آب ٢٠٠٢.

١٧١- هەمان سەرچاوە.

# بەشی چوارەم

# بەعەرەبکردنی کوردەکانی لوبنان

ژمارەیەکی زۆر لەرەقەندی کورد کەوتوونەتە لوبنان و لەوێدا دەژین و، زۆربەی سەرچاوەکانیش چوونی کورد بۆ لوبنان دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی بەو پێیەی لوبنان بەشێك بووە لەولاتی شام[172][173]. پاش ئەوەش کورد وردە وردە رووی لەلوبنان کردووەو دەتوانین بڵێین کۆچکردنی راستەقینەی کورد بۆ لوبنان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم، پاش ئەوەی کە تورك کەوتنە قڕکردن و بەتورککردنی کوردو هەوڵیاندا کورد لەبۆتەی تورکدا بتوێننەوە، بەتایبەت پاش شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، کە کەمالییەکان شۆڕشەکەیان سەرکوتکردو بەشێوەیەکی زۆر دڕندانەش کەوتنەوە جینۆسایدی کورد، ئەوە وایکرد ژمارەیەکی زۆری کورد لەماردین و بۆتان روو لە لوبنان بکەن[174]. (گەورەترین شەپۆڵی کۆچی کوردان بۆ لوبنان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٥-١٩٥٠، کە لەدەست زوڵمی تورکان رایان کردو روویان لە لوبنان کردو زۆربەشیان خەڵکی ماردین و طورعابدین بوون)[175]. کوردەکانی لوبنان زۆربەیان لەبەیروت و[176]، بەشێکیشیان لەنابلس

---

١٧٢- عصمت شريف وانلي، الاكراد في سوريا ولبنان، مجلة دراسات كردية، العدد ٤ (٨) . . . ص٧٠.

١٧٣- ريبوار عبدالرحمن، الاكراد في لبنان، مجلة ئالای ئيسلام العدد ابريل ١٩٩٧. . . ص١٠.

١٧٤- نفس المصدر. . . ص١٢.

١٧٥- ديڤيد مكدويل، اكراد لبنان، مجلة الاجراس، العدد ١٤. . . ص٤٤.

١٧٦- عصمت شريف وانلي، نفس المصدر. . .

دەژین[177] لەبارەی چۆنیەتی چوونی کورد بۆ لوبنان سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە بەشێکیان لەگەڵ سوپای سەلاحەددینی ئەییوبی چوون و ئەوانی تریش کە لە باکوورو ڕۆژئاوای کوردستان چوونەتە لوبنان بەم شێوەیە بووە لە ماردینەوە هاتوونەتە نسێبین و لەوێش بۆ قامشلۆو حەسەکەو پاشان بۆ دیرالزور و دواتر حەلەب و (حمص) و حماه) و ئنجا چوونەتە لوبنان[178]و، تێیدا نیشتەجێبوون.

لەسەر ژمارەی کوردەکانی لوبنان کۆمەڵێ سەرژمێرو بۆچوونی جیا هەیە، بەڕای هەندێك ژمارەیان ٧٥٠٠٠ حەفتاو پێنج هەزار تا ١٠٠,٠٠٠ سەد هەزار کەس دەبێت[179]و، هەندێکیش بە ١٠٠,٠٠٠ سەد هەزار کەس مەزەندەی دەکەن[180][181]، بەڵام ژمارەی کوردەکانی لوبنان لەو ژمارانە زیاترەو، ژمارەی تەواوی ئێستای کوردەکان لە لوبنان دەگاتە ١٥٧٠٠٥ کەس[182]. کوردەکانی لوبنان زۆربەیان لەگەڕەکە هەژار نشینەکان دەژین کە هەندێك بە (حزام الفقراء) ناوی دەبەن و، بەشێکیشیان لەناوچە بازرگانییەکاندا دەژین[183]. لەرووی ئاینییەوە زۆربەی هەرە زۆریان موسڵمانی سوننین[184] (٩٩,٦٪ی کوردەکانی لوبنان موسڵمانی سوننین و لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعین و ٠,٤٪شیان یەزیدین)[185].

بێگومان لوبنان وڵاتێکی عەرەبییەو شۆڤێنیەتی عەرەبی لەوێشدا کاری خۆی دەکات و هەوڵدەدات تەنها خۆی باڵادەست بێت و خەڵکی تریش بخاتە پەراوێزەوە، ئەگەر سەیر بکەین ئەو کوردانەی لە لوبنان دەژین بەدەست کۆمەڵێ گرفتەوە دەناڵێنن و لەرووی نەتەوەیی مەزهەبییەوە دەچەوسێنرێنەوەو لەهەموو مافێکیان بێ

---

١٧٧- ریبوار عبدالرحمن، نفس المصدر. . .

١٧٨- صلاح عصام ابو شقرا، الاكراد شعب المعاناة. . . ص٦١.

١٧٩- صلاح عصام ابو شقرا، الاكراد شعب المعاناة. . . ص٦٨.

١٨٠- عصمت شريف وانلي، سەرچاوەی پێشوو. . .

١٨١- ديڤيد مكدويل، سەرچاوەی پێشوو. . .

١٨٢- صلاح عصام ابو شقرا، سەرچاوەی پێشوو.

١٨٣- ديڤيد مكدويل، سەرچاوەی پێشوو. . .

١٨٤- عصمت شريف وانلي، سەرچاوەی پێشوو.

١٨٥- صلاح عصام ابو شقرا، سەرچاوەی پێشوو. . . ص٦٩.

بەش کراون، گەورەترین گرفتی کوردەکان لە لوبنان گرفتی بێ ناسنامەییە[186] و، دەسەلاتی لوبنان ناسنامەی لوبنانییان پێنادات و بەهاولاتی لوبنانیان دانانێت و، دەیەوێت لەم رێگەیەوە لەهەموو مافێکیان بێبەشیان بکات. ٧٠٪ی کوردەکانی لوبنان ناسنامەیان نییەو بەردەوام لەنیگەرانیدا دەژین، لەبەر ئەوەی لەهەموو مافێکیان بێبەشکراون و حکومەتی لوبنان پێیان دەڵێت ئەو داوایانەی کە پێشکەشتان کردووە بۆ وەرگرتنی ناسنامە لەژێر لێکۆڵینەوەدایە[187]. ئەوەی ناسنامەی نەبێت لەخوێندنی قوتابخانە بێبەش دەکرێت[188]. ئەمەش وایکردووە ژمارەیەکی زۆر لەکوردان لەخوێندن بێبەش بکرێن و رێژەی نەخوێندەواری لەناویاندا بگاتە ٣٧,٨٪[189]، بێ ناسنامەیی کوردی لەبیمەی تەندروستی بێبەشکردووەو، بەمەش گرفتێکی گەورەی تەندروستی بۆ دروستکردوون، کە ناتوانن لەنەخۆشخانەکاندا وەك هەر لوبنانیەکی تر چارەسەری تەندروستی وەربگرن و، پرسی نیشتەجێبوون لەخانوو و شوقەدا ئەویش گرفتێکی ترە کە رووبەڕووی کوردان دەبێتەوە[190]. زۆرجاریش کورد ناچار دەکرێت کە نەتەوەو مەزهەبی خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی ناسنامە وەربگرێت، وەك ئەوەی کە لەساڵی ١٩٥٦دا ١٧ کورد لەگەڵ خێزانەکانیان خۆیان خستە سەر تایەفەی مارۆنی تاناسنامەی لوبنانی وەربگرن[191]. شایانی باسە لەساڵی ١٩٦٢دا کە سوریا سەرژمێرییەکەی پارێزگای حەسەکەی ئەنجامدا زیاتر لە (٥٠٠٠٠) هەزار کورد لەرۆژئاوای کوردستانەوە روویان لە لوبنان کرد[192]، بەلام لەوێشدا ناسنامەیان وەرنەگرت. نەخوێندن و نەنووسین و نەهیچ شتێك بەزمانی

---

١٨٦- عصمت شريف وانلي- سەرچاوەی پێشوو. . .

١٨٧- ریبوار عبدالرحمن- سەرچاوەی پێشوو. . .

١٨٨- صلاح عصام ابو شقرا، سەرچاوەی پێشوو. . ص٧٤.

١٨٩- هەمان سەرچاوە. . . ص٧٢.

١٩٠- هەمان سەرچاوە. . . ص١٤٠-ص١٤٢.

١٩١- هەمان سەرچاوە. . . ص١٥٠-ص١٥١.

١٩٢- ديڤيد مكدويل.. سەرچاوەی پێشوو. .

کوردی نین ئەمەش وای کردووە کە کوردەکانی لوبنان (نە گەورەیان نەبچوکیان) بەکرمانجی قسە نەکەن و[193]، بەزمانی عەرەبی قسە بکەن، زۆرجاریش دەسەڵاتی لوبنان هەوڵدەدات کوردەکانی لوبنان بکاتە عەرەب و لەبۆتەی عەرەبیدا بیان توێنێتەوە. وەك ئەوەی کە ماردینییەکان دەگەڕێنێتەوە سەر عەرەب و پێیان دەڵێت ئێوە لەبنچینەدا عەرەبن[194]. کوردەکانی لوبنان شانازی بەکورد بوونی خۆیان دەکەن و تائێستا هەوڵدەدەن پارێزگاری لەداب و نەریتی نەتەوەیی خۆیان بکەن، هەرچەندە حکومەتی لوبنان هەوڵدەدات بەتەواوی تێکەڵی کۆمەڵی لوبنانیان بکات، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا ساڵانە یادی نەورۆز دەکەنەوەو تائێستا ٣٧٪یان پارێزگارییان لەداب و نەریتی کوردانەی خۆیان کردووە[195]. هەوڵدەدەن پەیوەندی لەگەڵ کورد لەپارچەکانی تری کوردستان ببەستن، بۆ نموونە پەیوەندییەکی بەتین لەنێوان کوردەکانی لوبنان و کوردانی رۆژئاوای کوردستان هەیە[196].

کورد، لە لوبنان تووشی کوشتن و راوەدوونان و گرتن و ماڵوێرانکردن بۆتەوە، لەساڵی ١٩٧٦دا لەشەڕی ناوخۆیی لوبناندا، ژمارەیەکی زۆری کورد لەسەر دەستی کەتایبی مارۆنییەکان (كتائب المارونية) کوژران و ماڵەکانیان روخێنران و لەگەڵ زەویدا یەکخران و زۆریشیان بۆ باشووری بەیروت رایان کردو دەربەدەر بوون[197]. هەروەها لەکاتی داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیلەوە لە حوزەیرانی ١٩٨٢دا ژمارەیەکی زۆر لەکورد دەربەدەر کران و، زۆربەیان بۆ دۆڵی (البقاع) کۆچیان کردو، لەکۆتاییەکانی ١٩٨٣یشدا میلیشیای سەرەکی شیعەکان (حركة الأمل) ژمارەیەکی زۆری لەخێزانە کوردەکان دەستگیرکرد[198]. کورد لەشەڕی ناوخۆیی لوبنان زیانێکی

---

١٩٣- صلاح عصام ابو شقرا.. سەرچاوەی پێشوو. . . ص٥٨.

١٩٤- صلاح عصام ابو شقرا.. سەرچاوەی پێشوو. . . ص٥٨.

١٩٥- هەمان سەرچاوە. . . ص١٥٢، ص١٥٣، ص١٥٥.

١٩٦- دیڤید مکدریل، سەرچاوەی پێشوو. . .

١٩٧- هەمان سەرچاوە. . . ص٤٥.

١٩٨- هەمان سەرچاوە. . .

زۆری لێکەوت[١٩٩] ناچار کوردەکان بۆ بەرگری لەخۆ کردن لەشەڕی ناوخۆیی لوبنان چەکیان هەڵگرت بۆ ئەوەی بتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن[٢٠٠].

دوای ئەوەی کە سوپای سوریا چووە لوبنان، ئەویش کەوتە چاودێری کوردەکانی لوبنان و زۆر بەتوندیش چاودێری دەکردن و هەندێ جاریش دەیگرتن و ئازاری دەدان (کوردەکان لە لوبنان زیاتر لەهەر کەسێکی تر زیانیان پێگەیشتووە بۆیە تائێستاش هەست بەوە دەکەن کە هیچ دۆستێکیان نییە)[٢٠١]. ئەمەش وای کردووە کورد لە لوبنان بۆ دەرەوەی لوبنان کۆچ بکەن و روو لەئەوروپاو ولاّتانی تری جیهان بکەن، هۆی کۆچ کردنەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری ئەمنی و ئابووری و بێ ناسنامەیی[٢٠٢]. لەرووی ئەمنییەوە بەردەوام چاودێری دەکرێن و هەندێ جاریش دەگیرێن بۆ نموونە لەساڵی ٢٠٠١دا سوپای سوریا لە لوبنان کۆمەڵێ کوردی دەستگیر کردو ماڵەکانیشی رووخاندن. لەرووی ئابووریشەوە کە ناسنامەیان نەبێت کاریان پێنادرێت و، لەرووی بێناسنامەییشەوە، تائێستاش کێشەی سەرەکییان بێ ناسنامەییەو ناسنامەشیان نەبێت هیچیان بۆ ناکرێت. بەم شێوەیە کوردەکانی لوبنان کە ٣٪ی دانیشتوانی لوبنان پێکدێنن[٢٠٣]، تائێستا ٧٠٪یان بێناسنامەن و لەهەموو مافێك بێبەشکراون و ورده ورده بەعەرەبدەکرێن و لەبۆتەی عەرەبیدا دەتوێنرێنەوە.

شایانی باسە ژمارەیەکی زۆری کورد لەئوردنیش دەژین، کە ژمارەیان دەگاتە (١٥٠٠٠) پانزە هەزار کەس و بەسەر شارو گوندەکانی ئوردەندا دابەش بوون، بەلاّم بەشێوەی سەرەکی لە (عمان)و (الزرقاء)و (إربد) دەژین[٢٠٤]و، بەکاری بازرگانی و

---

١٩٩- عصمت شريف وانلي، سەرچاوەی پێشوو. . .

٢٠٠- رێبوار عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو. . . ص١٢.

٢٠١- دیڤید مکدویل- سەرچاوەی پێشوو. . . ص٤٦.

٢٠٢- صلاح عصام ابو شقرا، سەرچاوەی پێشوو. . . ص١٦٨- ص١٧٠- ص١٧١.

٢٠٣- دیڤید مکدویل- سەرچاوەی پێشوو. . . ص٤٧.

٢٠٤- محمد علي الصويركي الكردي، عمان تاريخ وحضارة وآثار. . . ص١٩١.

کشتوکاڵ و فەرمانبەری دەوڵەت خەریکن. ئەوانیش تێکەڵ بەکۆمەڵگای ئوردن کراون و هەوڵدەدرێت لەنێو عەرەبدا بتوێنرێنەوە، لەگەڵ ئەوەیدا کە شانازی بەکورد بوونی خۆیان دەکەن، بەلاّم زمانی کُوردی نازانن و بەعەرەبی قسە دەکەن.

# مەترسییەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان

پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان، پیلانێکە بۆ سڕینەوەی بوونی نەتەوەیەك بەخاك و خەڵکەوە، کە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان پیلانڕێژی بۆ کراوەو پیادە دەکرێت. ئەم پیلانە لەهزرێکی شۆڤێنیی و فاشیی و ڕەگەزپەرستانە سەرچاوەی گرتووە، هزرێك کە تەنها بوونی خۆی دەبینێ و، بوونی خەڵکانی تر ڕەت دەکاتەوەو چاودەبڕێتە ماڵ و سامان و خاکیان، بۆ ئەم مەبەستەش پەنا دەباتە بەر شێوازەکانی قڕکردن و جینۆسایدو دەستبەسەرداگرتنی خاك. خۆ ئەگەر نەتوانێ خەڵکەکە قڕ بکات ئەوا پەنا دەباتە بەر پاکتاوی نەژادی (التطهير العرقي)ی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەو هەوڵی تواندنەوەیان لەبۆتەی عەرەبی دەدات. وەك ئەوەی لەعێراقدا بەپێی بڕیاری ۱۹۹ لە ۲۰۰۱/۹/٦ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) هەوڵدەدرێت کە کورد نەتەوەی خۆی بگۆڕێت و خۆی بکاتە عەرەب، ئەگەر ئەوەش نەکات ئەوا دووچاری ڕاگواستن و نانبڕین دەبێتەوە. ئەم سیاسەتەش زۆر بەچڕی لەسەر دەستی حزبی بەعسی کۆنە پەرست و فاشی لەعێراق و سوریادا جێبەجێ دەکرێت.

کەسێکی وەك میشێل عەفلەق کە دامەزرێنەری حزبی بەعسی فاشییە باوەڕی وایە کە کورد ڕەسەنیان عەرەبە، بەڵام ئیمپریالیزم وای لێکردوون کە زمانی خۆیان لەبیر بچێتەوە[۲۰۵]. ئەوەش شێواندنی مێژوو و ڕووی ڕاستییەو لای کەس نایەتە باوەڕکردن، لەبەر ئەوەی کورد لەنەژادیشدا ناچنەوە سەر عەرەب و دوو نەتەوەی لەیەکتر جیان، بەڵام شۆڤێنیەتی عەرەب باکی بەگۆڕینی ڕاستییە مێژووییەکانیش نییەو زۆر بێ ویژدانانە کار بۆ سڕینەوەو لەناوبردن و تواندنەوەی نەتەوەکانی تر دەکات، ئەوەتە کەسێکی شۆڤێنی عەرەبی وەك (عوني فرسخ) دەڵێ: (کوردو بەر بەرو ئاشوورییەکان و ئەوانیتریش، لەڕەسەندا عەرەبن و شتێکی تر نین)[۲۰٦]. ئەوەش لوتکەی شۆڤێنییەتە، کە جگە لەعەرەب دان بەبوونی کەسی تردا نانێن، هەر ئەو

---

۲۰۵- مجلة المنبر، العدد- اذار ۱۹۹۹. . . ص۱۰.

۲۰٦- نفس المصدر. . .

(عوني فرسخ)ە باوەڕی وایە کە ئەوەی بەعەرەبی قسە بکات عەرەبە[٢٠٧] نەك هەر لای ئەوانە بەڵکو هەر لەکۆنەوە شۆڤێنیەتی عەرەب هەوڵی داوە نەتەوەی کورد بکاتە عەرەب (مێژوو نووسە کۆنەکانی عەرەب تەواو وەکو عارەبە داگیرکەرەکانی ئەوڕۆ کوردیان بۆ سەر "رەچەڵەکی عارەب" گێڕاوەتەوە)[٢٠٨]. ئەوانەی ئێستاش ئاو لەکانی لیخنی ئەوانەی پێشوو دەخۆنەوە. هەر بۆیە یەکێکی وەکو (زکي الابسوزي) شەکر دەشکێنێ‌و دەڵێ (کێ عەرەبە؟ ئەوەی لەسەر خاکی عەرەب بێ‌و بەعەرەبی قسە بکات ئەوە عەرەبە) بەپێی دەستووری هەردوو وڵاتی عەرەبی (عێراق و سوریا) باشوور و رۆژئاوای کوردستان بەشێکن لەخاکی ئەوان و ئەوانیش بەشێکن لەنیشتمانی عەرەب و نەتەوەی عەرەب. ئەوەتە لەماددەی دووەمی پرۆژەی دەستووری عێراقدا هاتووە (عێراق بەشێکە لەنیشتمانی عەرەب)[٢٠٩]و، لەماددەی چوارەمیشدا هاتووە (هەرێمی عێراق یەکەیەکەو دابەش ناکرێت و، بەهیچ شێوەیەك ناکرێ دەستبەرداری بەشێکی بین جا لەبەر هەر هۆیەك و بارودۆخێك بێت)[٢١٠] لەبڕگەی یەکەمی ماددەی یەکی دەستووری سوریاشدا هاتووە (بەهیچ شێوەیەك دەستبەرداری پارچەیەك لەخاکی سوریا نابین)[٢١١]، لەبڕگەمی دووەمی هەمان ماددەشدا هاتووە کە (هەرێمی سوریای عەرەبی بەشێکە لەنیشتمانی عەرەب)[٢١٢]، هەروەها لەبڕگەی سێیەمیشدا هاتووە (گەلی سوریا بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب)[٢١٣]. جگە لەمەش سوریا بەهیچ شێوەیەك دان بەبوونی کورددا نانێ‌و هەوڵدەدات خەڵکی تریش بهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە کورد لەسنووری جوگرافی دەوڵەتی سوریادا نییەو ئەوەی هەشە یان عەرەبە یان هاولاتی سوریا نییەو بیانییەو، زۆر بەجدیش کار بۆ ئەوە دەکات (کار

---

٢٠٧- مجلة المنبر، العدد- اذار ١٩٩٩. . . ص١٠.

٢٠٨- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . . ل٥١.

٢٠٩- مشروع دستور جمهوريه العراق. . . ص١١.

٢١٠- نفس المصدر. . .

٢١١- دستور الجمهورية العربية السورية. . . ص٨.

٢١٢- نفس المصدر. . .

٢١٣- نفس المصدر. . .

بەدەستانی سوریا بوونی کورد لەووڵاتەکەدا بۆ ڕۆژنامەنووسانی بێگانە بەدرۆ دەخەنەوە)[٢١٤]

بەم شێوەیە شۆڤێنیەتی عەرەبی خاکی کوردستان بە بەشێك لەنیشتمانی عەرەب و نەتەوەی کوردیش بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب دەزانێت و دەسەڵاتی عەرەبی و بەناو ڕۆشنبیرانیشی لەسەر ئەوە کۆکن و بەیەك ئاراستە کار بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کوردو زەوت کردنی خاکەکەی دەکەن. ئەوەش گەورەترین مەترسیی و هەڕەشەی پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستانە، کە هەڕەشە لەبوونی خاك و نەتەوەکەمان دەکات. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی هاوکاری نێوان دەسەڵات و بەناو ڕۆشنبیرانی عەرەب بۆ پیلانی بەعەرەبکردنی کورد و کوردستان دەتوانین چەند نموونەیەك وەربگرین. ((قاسم[٢١٥] فەرمانی بە ڕۆژنامەی (الثورة)ی زوڕناژەنیدا، قاپی کورد بگرێت. (الثورة) لەژمارە (٥٥٥)ی ١٩٦١/٢/١٧دا گوتارێکی نووسیی و داوای تواندنەوەی کوردی کردبوو))[٢١٦]. هەر لەساڵی ١٩٦١دا ڕۆژنامەی (الثورة) کە ئەوکات (یاسین الطائي) سەرنووسەری بوو وتارێکی کەسێکی شۆڤێنی بەناوی (قلوقیس مقصود) بڵاوکردەوە کە تێیدا هاتبوو (پێویستە دەست بەسەر سەرکردایەتی کورد دابگیرێو نەتەوەی کوردیش لەبۆتەی عەرەبیدا بتوێنرێتەوە)، ئەوکات پارتی دیموکراتی کوردستان بەرەنگاری ئەو هێرشانە بۆوەو، ١٦٠٠٠٠ سەدو شەست هەزار بروسکەی ناڕەزایی لەم بارەیەوە گەیشتنە عبدالکریم قاسم، بەڵام قاسم ئیدانەی نەکرد. شۆڤێنیەتی عەرەب هەمان سیاسەت بۆ بەعەرەبکردنی نەتەوەکانی تریش پیادە دەکات، وەك ئەوەی لەمیسر بەرامبەر قیبتییەکان و لەجەزائیرو مەغریب بەرامبەر بەربەرەکان پیادە دەکرێت. ئەوەتە شۆڤێنییەتی عەرەب بەم شێوەیە لەبەر بەرەکان دەدوێت (فالبربر العرب ينتمون الى الجذور العربية دون مبالغة او مواربة– بل هم لحمة عروبة المغرب العربي الكبير بكامله وهم قوام العرب المغاربة ومادتهم)[٢١٧].

---

٢١٤- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . . ل١٣٧.

٢١٥- هەمان سەرچاوە. . . ل٢٠١.

٢١٦- مەبەست عبدالکریم قاسمە.

٢١٧- محمد علي مادون، عروبة البربر. . . ص٧.

لەسەردەمی کۆنیشدا عەرەب ویستوویانە نەك هەر کورد بگرە هەموو ئەوانەی کە ناعەرەبن بیانهێننە ژێر دەسەلاتی خۆیان (پاش مردنی محەممەد، فەرمانڕەوایانی عەرەبی موسڵمان لەگەڵ گەلە ناعەرەبەکاندا، پێچەوانەی ئەو ئایەتە جووڵانەوە کە لەقورئاندا دەبێژێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾)[218]. چەوساندنەوەی نەتەوەکانی تر لەسەر دەستی ئەمەوییەکان گەیشتبووە لوتکە، هەر کەسێك لەنەتەوەکانی تر ببوونایە موسڵمان، ئەوا پێیان دەگوتن (مولی) کە کۆیەکەی لەعەرەبیدا دەبێتە (موالی)و هیچ کاتێك بەهاولاتی پلەیەك هەژمار نەدەکران (ئەم "موالی"یانە بەچاوێکی زۆر سووکەوە تەماشا دەکران)[219]. کەواتە دەتوانین بڵێین هزری شۆڤێنییەتی عەرەبی ئێستا درێژە پێدەری هزری شۆڤێنییەتی بەرێیانەو لەیەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون و، بەسوود وەرگرتن لەکلتوری رابردوویان پیلانڕێژی بۆ سیاسەتی ئێستایان دەکەن. کلتوری رابردووی عەرەبیش بریتییە لەهێرش و قڕکردن و تالانکردن هێرش بۆ داگیرکردنی خاکی خەڵکی ترو فراوانکردنی سنووری دەسەلاتیان و، قڕکردنیش بەمەبەستی نەهێشتنی بەرهەڵست و خۆ سەپاندنیان، تالانکردنی ماڵ و سامانیش بۆ خۆژیاندن و خۆ بەڕێوەبردنیان، لەبەر ئەوەی عەرەب کۆچەرو دواکەوتوو بوون خودان کلتورێکی شارستانی نەبوون و لەسەر بنەمای شارستانیەتی نەتەوەکانی تر بینای شارستانیەتی خۆیان کرد. لەم پێناوەشدا ئەوەی لەدەستیان هات لەدژی نەتەوەکانی تردا ئەنجامیاندا (کوردستان وەکو ولاتێك لەئەنجامی پرۆسەی فەتحدا کەوتە ژێر دەسەلاتی سەربازیو ئیداری دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامیەوە کە ئەوەش ڕێگای خۆشکرد بۆ ئەوەی بەرنامەی ئاینی نوێی ئیسلام و دەسەلاتی نوێی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی کۆنترۆڵی هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەلایەتیو سیاسیو ئابووریو ئیداریو رۆحی کورد بکات)[220]. دژایەتی کردنی کورد و تواندنەوەی کورد لەبۆتەی عەرەبیدا کە لەلایەن رژێمی فاشی بەعس لەعێراق و سوریادا کاری

٢١٨- جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی کوردی. . . ل١٧.

٢١٩- هەمان سەرچاوە. . . ل١٨.

٢٢٠- عەتا قەرەداخی، کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد. . . ل٦٣-٦٤.

لەسەر دەکرێت، درێژەی ئەو سیاسەتەیە کە لەکۆنەوە لەلایەن شۆڤێنیەتی عەرەبەوە پیادە کراوە (بەشێك لەمێژوونووسانی عەرەب و ئیسلام هێندە بەرق و کینەوە سەیری کوردیان کردووە تەنانەت ویستوویانە لەریزی مرۆڤیشدا دای نەنێن)[٢٢١] بێگومان ئەوەش ئەو پەڕی شۆڤێنیەتی عەرەبەو لەتەواوی بەها مرۆڤایەتییەکان دابڕاوە.

بەعەرەبکردنی کوردستان وەك روونمان کردەوەو کە لەمەزرێکی شۆڤێنی و کۆنەپەرستی عەرەبییەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆتە مەترسییەکی گەورە لەسەر تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی کوردو دوارۆژی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان. بۆیە بەپێویستی دەزانین کە مەترسییەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان لەسەر هەر یەکێك لەتایبەتمەندییە نەتەوەییەکانمان بەجیا باس بکەین:

١-**خاك**: یەکێکە لەتایبەتمەندییە سەرەکییەکانی هەر نەتەوەیەك و ئەو نەتەوەیە لەسەریدا دەژیت و خۆشی دەوێ و قوربانی لەپێناو پاراستنیدا دەدات. شۆڤێنیەتی عەرەب لەکۆنەوە تائێستا چاوی بڕیوەتە خاکی کوردستان و هەوڵی داگیرکردنی دەدات و دەیەوێت بیکاتە بەشێك لەخاکی عەرەب، وەك ئەوەی کەئێستا هەر یەك لەداگیرکەرانی کوردستان (سوریاو عێراق) رۆژئاواو باشووری کوردستان بە بەشێك لەخاکی خۆیان و نیشتمانی عەرەب دەزانن و لەدەستووری خۆشیاندا جێگیریان کردووەو ئامادەش نین دەستی لێ هەڵبگرن. عێراق و سوریا وەك دوو دەوڵەتی داتاشراوو ناسروشتی کە لەناوچەکەدا دروستکراون و باشوور و رۆژئاوای کوردستانیان پێوە لکێنراوە، بەردەوام بەئاگرو ئاسن کەوتونەتە گیانی کورد بۆ پاراستنی سنووری دەستکردیان و داگیرکردنی خاکی کوردستان، بۆ ئەمەش کەوتوونەتە راگواستنی کورد لەسەر خاکی خۆی و هێنان و نیشتەجێکردنی (استیطان)ی عەرەب لەسەر خاکی کوردستان و، شێواندن و گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان و بەناوکردنی زەوی و زاری کوردان بەناوی عەرەبی هێنراوو، سڕینەوەو ونکردنی تۆماری تایبەت بەتاپۆی زەوی و زاری کوردان. هۆکارەکانی داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی خاکی کوردستانیش لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە

---

٢٢١- هەمان سەرچاوە. . . ل٧٨.

دەگەڕێتـــەوە بـــۆ دەوڵەمەنـــدی خـــاکی کوردســـتان لـــەرووی کانـــەکانی نـــەوت و سەرچاوەکانی وزەو گازی سروشتی و جۆرەها کانزاو بەردی بەنرخ و، بەپیتی خاکی کوردستان لەرووی کستوکاڵ و بەروبوومی سروشتی و لەوەڕگاوەو، لەباری سروشتی ڕەنگینی کوردستان بۆ گەشت و گوزارو.. ...، ئەمانەش دەبنە بنەمایـەك بۆ بنیاتنـانی ئابوورییەکی پتەوو دەوڵەمەند، کە ئەمەش مەرجی سەرکەوتنی هەر دەسەڵاتێکە، هەر بۆیەش داگیرکەرانی کوردستان بەهـەموو شێوەیەك کار دەکـەن بۆ ئـەوەی کوردستان بکەنە بەشێکی جیانەکراوە لەوڵاتەکانیاندا. جگـە لەمانـە پێگەی سیاسی و ستراتیژی کوردسـتان ئـەویش هۆکارێکـە بـۆ ئـەوەی داگیرکـەرانی کوردسـتان زیـاتر چـڕنوك لەخاکەکەی گیر بکـەن. ئەگـەر سـەرنج بدەین ڕژێمـی داگیرکـەری عێـراق زیـاتر چـاوی بڕیوەتـە شـوێنە سـتراتیژی و دەوڵەمەنـدەکانی کوردسـتان وەك (کـەرکوك، مـەخموور، شنگاڵ، خانەقین، زەمار، شێخان، مەندەلی، بەدرەو جەسـان. .)و ڕژێمـی داگیرکـەری سـووریاش کاتێـك نـەوت لەناوچـەی قەرەچـووغ[222] لەجـەزیرە دۆزرایـەوە کەوتـە ڕاگواستنی کورد لەو شوێنەو دروستکردنی (پشتێنەی عەرەبی)و هێنـانی عـەرەب بۆ ناوچەکە. بەم شێوەیە شۆڤێنییەتی عەرەب خاکەکەمانی داگیرکردووەو بەخاکی خۆی دەزانێت و، وای نیشاندەدات کە کورد خاکی نییەو لەسەر خاکی عەرەبدا میوانە، زۆر جاریش گوێمان لـەو بەنـدو باڵۆرانـە دەبێـت. بـەڵام دەسـەڵاتدارانی عـەرەب دەبـێ باش بزانن کە تاسەر ئەمـەیان بۆ ناچێتە سـەرو خـاکی کوردسـتان هـی کوردەو نابێتـە هـی کەسی تر.

٢-**زمان:** وەك تایبەتمەندییەکی نەتەوەیی، ئـەویش کەوتۆتـە بـەر مەترسـی شـاڵاوی بەعەرەبکردنی کوردستان و، هەر لەکۆنەوە شۆڤێنییەتی عەرەب ویسـتوویەتی زمـان و کلتـوری کـورد بـسڕێتەوەو زمـان و کلتـوری عـەرەب بـسەپێنێتە سـەر کـورد. لـەپاش جـەنگی (القادسـیة)ەوە لـە ٦٤٠ی زاینیـدا، ئـەوە سـەرەتای دەستبەسـەرداگرتنی کوردستان بوو لەلایەن عەرەبەوەو، ئەو دەستبەسەرداگرتنە عەرەبییە بزووتنەوەیـەکی بەعەرەبکردن بوو بۆ بچوککردنەوەو سڕینەوەی بەها نەتەوەییەکانی کوردو پشتگوێ

---

٢٢٢- قەرەچووغ: شاخێکە لەرۆژئاوای کوردستان و نەوتی سەرەکی سـووریا لـەو ناوچـە دایـەو نـاونراوە (حقول سویداء)و، کەوتۆتە نزیك سنووری دەستکردی نێوان عێراق- سوریا. شایانی باسە لەمـەخموریش چیایەك بەناوی (قەرەچووغ) هەیەو کۆمـەڵێ چاڵە نەوتیشی لێدۆزراوەتەوە.

خستنی زمان و کلتوری کوردو، کارکردن بۆ بلاّوکردنەوەو سەپاندنی زمان و کلتوری عەرەبی[٢٢٣]. بەمەش ویستیان زمان و کلتوری کورد لەناو ببەن، بەلاّم خۆشبەختانە زمان و کلتوری کورد لەسەر دەستی هۆزانڤان و رۆشنبیرانی کورد پارێزراو مایەوە. زمانی هەر نەتەوەیەك لەگەلّ لەدایکبوونی نەتەوەکە لەدایکدەبێت[٢٢٤]. بۆیە دەسەلاّتی عەرەبی بۆ لەناو بردن و سڕینەوەی نەتەوەی کورد هەولّی سڕینەوەو نەهێشتنی زمانی کوردی داوە. ئەم هەولّدانەش لەسەدەکانی رابردووەوە تائێستا درێژەی هەیەو، لەگەلّ دروستکردنی دەولّەتی عێراقیشدا کار بۆ پشتگوێ خستن و سڕینەوەی زمانی کوردی کراوە، دوای دروستکردنی عێراق کابرایەکی شۆڤێنی عەرەب کە ناوی (ساطع الحصري) بوو، کرا بە بەڕێوەبەری گشتی زانیاری (المعارف) و لەماوەی نێوان (١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ تا ٣١ی تەمووزی ١٩٢٧) لەکارەکەیدا مایەوە، (ساطع الحصری) کەسێکی شۆڤێنی بوو، لای ئەو زمان یەکەم پێوەر بوو بۆ خۆ بەستنەوە بەولاّتی عەرەبی و هەر کەسێ بەعەرەبی قسە بکات ئەوە عەرەبە جا ئاین یا رەگەز یا مێژووی هەر چییەك بێت[٢٢٥]. هەولّی دەدا زمانی کوردی پشتگوێ بخات و بیانووی زۆری دەدۆزییەوە بۆ ئەوەی کورد بەزمانی خۆی نەخوێنێت و بەزمانی عەرەبی بخوێنێت ئەوەشی بۆ ئەوە بوو وردە وردە زمان و کلتوری کوردی بسڕێتەوە، بێگومان هەر زمانێك کەپێی نەخوێنرێت و پێی نەنووسرێت پێشناکەوێت و گەشە ناکات. پاشتر رژێمی کۆماری عێراق لەسالّی ١٩٦٠دا دەستی کرد بەراگواستنی مامۆستایانی کورد لەکەرکوك (فەرمانێکی وەزاری هاتووە بۆ بەڕێوەبەرایەتی زانیاری لیوای کەرکوك بۆ ئەوی هەرچی دەرچووانی دار المعلمین و معلمات هەیە لەکوردەکان لەسلێمانی دابنرێت نەك لەکەرکوك)[٢٢٦]. بڕوانە بەلّگەنامەی ژمارە (٧٠)، ئەوەش هەولّێك بووە بۆ نەهێشتنی خوێندنی کوردی لەکەرکوکدا. خوێندنی کوردیو بزاڤی کلتوری کورد بەردەوام لەلایەن دەسەلاّتی عەرەبییەوە چ لەعێراق و چ لەسوریادا دژایەتی کراوە. هەر چەندە لەبڕگەی (ب)ی

---

٢٢٣- مازن بلال، المسألة الكردية الوهم والحقيقة. . . ص١٤٣.

٢٢٤- نفس المصدر. . . ص١٤٧.

٢٢٥- گۆڤاری مەتین، ژمارە ٩٩- نیسان ٢٠٠٠. . . ل٨٥-٨٦.

٢٢٦- رۆژنامەی ژین، ژمارە (١٥٧٦) سالّی (٣٥) دووشەممە ١٠/١٠/١٩٦٠.

ماددەی حەوتەمی دەستووری کاتی عێراقدا هاتووە (زمانی کوردی زمانی رەسمی دەبێت شان بەشانی زمانی عەرەبی لەناوچەی کوردیدا)[227]، بەڵام زۆر کەم کار بەو دەقە کراوە، رژێمی عێراق بەتایبەت بەعس بۆ ئەوە سوودی لەزمانی کوردی وەرگرتووە بیرو بۆچوونە بۆ گەنەکانی خۆی لەرێی زمانی کوردییەوە بگەیەنێتە کورد، ئەگەرنا بەردەوام دژایەتی زمان و کلتوری کوردی کردووەو بڕیاری تایبەتی لەم بارەیەوە داوە، بڕیاری ٦٣٢ لە ١٩٨٩/١٠/٧ی بەناو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) زۆر راشکاوانە دژایەتی زمانی کوردی دەکات و بەشتێکی بێ بایەخی دادەنێ. لەبڕگەی یەکەمی ئەو بڕیارەدا هاتووە کە قوتابی بەدەرنەچوو (راسب) دانانرێ ئەگەر هاتوو لەوانەی زمانی کوردیدا دەرنەچوو، ئەو بڕیارەش هەموو ئەو قوتابخانانە دەگرێتەوە کە زمانی کوردییان تێدا دەخوێنرێت. لەبڕگەی دووەمیشدا بڕیارەکە کراوە بەبڕیارێکی یەکلایی کەرەوەو تێیدا هاتووە (کار بەهیچ دەقێکی تری پێچەوانەی ئەو دەقە ناکرێت)[228]. ئەگەر لەعێراقدا خوێندنیش بەزمانی کوردی بووبێ ئەوا بەشتێکی کەم بایەخ سەیر کراوەو، پرۆگرامی خوێندن هەمان پرۆگرامە عەرەبییەکە بووەو وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، پرۆگرامەکەش بەهیچ شێوەیەك گوزارشتی لەکۆمەڵی کوردەواری نەکردووە، بۆ نموونە لەبابەتی مێژوودا مێژووی نیشتمانی عەرەب و، لە بابەتی جوگرافیادا جوگرافیای نیشتمانی عەرەب و لەبابەتەکانی تریشدا هەر هەمووی هی عەرەب دەخوێنرێت، ئەوەش بۆ ئەوە بووە کە خوێندەڤانی کورد هەمیشە عێراق بەوڵاتی خۆی بزانێ و لەرێی عێراقیشەوە (نیشتمانی عەرەبی) بەنیشتمانی خۆی بزانێ و مێژوو و جوگرافیاو شارستانییەتی ئەوانیش بەهی خۆی بزانێت و، هەست نەکات کە کوردستان نیشتمانی ئەوەو بەشێکی بەزۆر بەعێراقەوە لکێنراوەو داگیرکراوە. رژێمی بەعس بە بەردەوامی هەوڵی سڕینەوەی زمان و کلتوری کوردی داوەو، قوتابخانە کوردییەکانی داخستووەو، لەساڵی خوێندنی (٢٠٠٠-٢٠٠١)ەوە لەسەرتاسەری عێراقدا لەهیچ قوتابخانەیەکدا خوێندنی بەزمانی کوردی نەهێشتووەو هەمووی کردووە بەعەرەبی، لە (کەرکوك،

---

٢٢٧- د.حكمت حكيم، الدساتير العراقية المؤقتة وحقوق المواطن العراقي. . . ص٩٤.

٢٢٨- جريدة الوقائع العراقية، العدد ٣٢٧٨، اليوم ٢٣/١٠/١٩٨٩.

مەخموور، شنگاڵ، زەمار، قەراج، خانەقین،.. .و شوێنانی تریش) خوێندنی عەرەبی سەپاندۆتە سەر کورد.

لەو ڕێیەوە ڕژێمی عێراق دەیەوێت زمان و کلتوری خۆی بسەپێنێتە سەر کوردو زمان و کلتوری کوردیش کەم بایەخ بکات. ئەگەر سەیر بکەین دەبینین ئێستاش کاریگەرییەکی زۆری کلتورو زمان و هزرو سیاسەتی عەرەبی بەسەر ڕۆشنبیرانی کورد لەباشووری کوردستاندا دیارە، ئەمە بۆ ڕۆژئاوای کوردستانیش ڕاستە، لەبەر ئەوەی نەتەوەی سەردەست هەوڵدەدات هەموو شتێکی خۆی بسەپێنێتە سەر نەتەوەی بندەست، لەباکووردا کاریگەری زمان و کلتوری تورك و لەرۆژهەڵاتیشدا کاریگەری زمان و کلتوری فارس بەسەر زمان و کلتوری کورددا هەیە. ئەم سیاسەتەی داگیرکەرانی کوردستان سێ واقیعی کلتوری جیا لەیەکی دروستکردووە. لەهەریەك لەتورکیاو ئێراندا خوێندن بەزمانی کوردی قەدەغەیەو ڕێی پێنادرێ و کوردیان ناچار کردووە بەزمانی ئەوان بخوێنێ و بنووسێ، دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان لە کۆنەوە تائێستا زمانی خۆیان سەپاندۆتە سەر کورد (کوردەکان بەناچاری زمانی دەستەڵات دارانیان لەکاروباری ڕەسمییدا بەکاردەهێنا)[229]. وەك لەپێشەوە باسمان کرد عێراق بە بەردەوامی هەوڵی سڕینەوەی زمان و کلتوری کوردی داوەو کەنار گیری کردووە.

لەسوریاشدا خوێندن و نووسین بەزمانی کوردی قەدەغەیەو تەنها دەبێت بەزمانی عەرەبی بێت و ئەمەش لەماددەی (٤)ی دەستووری سوریادا جێگیر کراوە، کە دەڵێت (زمانی عەرەبی زمانی ڕەسمییە)[230]. شۆڤێنییەتی عەرەبی هەستی بەوەکردووە، کە ئەگەر زمانی کوردی ڕێی پێبدرێت ئەوا گەشە دەکات و تایبەتمەندییەکانی خۆی دەپارێزێت، بۆیە کەوتۆتە دژایەتیکردنی زمانەکەمان. بێگومان زمانیش هۆکاری لەیەکتر گەیشتن و خوێندن و نووسین و بیرکردنەوەیەو یەکێکە لەتایبەتمەندییە بنچینەییەکانی هەر نەتەوەك. لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتی و قەدەغەکردنەشدا زمانی

---

٢٢٩- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . . ل١٧٦.

٢٣٠- دستور الجمهورية العربية السورية. . . ص٩. ٠

کوردی لەرێی رۆشنبیرانی کورد بەردەوام بەرەنگاری داگیرکەرانی کوردستان بۆتەوەو خۆی پاراستووەو لەگەشە کردنیشدایە. وەك بۆمان دەرکەوت بەعەرەبکردنی کوردستان مەترسییەکی زۆری بۆ سەر مانەوەو گەشەکردنی زمانەکەمان هەیەو بۆتە هەرەشە لەسەر نەهێشتن و سڕینەوەی زمانەکەمان.

٣-مێژوو: هەر نەتەوەیەك خودان مێژوویەکی تایبەت بەخۆیەتیو، مێژووی هەر نەتەوەیەك تۆمارێکی گشتی ئەو نەتەوەیەیە، کە خۆشیو ناخۆشیو سەرکەوتن و کارەساتی نەتەوەکەی تێدا تۆمار کراوەو، لەلایەن ئەندامانی نەتەوەکە شانازی پێوە دەکرێت و پەندی لێوەر دەگیرێت. کوردیش وەك هەر نەتەوەیەکی تر خودان مێژووی خۆیەتیو شانازیش بەمێژووەکەی دەکات، مێژووی کورد بریتیە لەبەرەنگاریو کەوتن و هەڵسانەوەو تێهەڵچوونەوە، کورد بەدرێژایی مێژوو بەردەوام لەبەرەنگاریدا بووە لەبەرامبەر ئەو هێرشانەی کراونەتە سەر کوردو خاکەکەیو زۆرجار سەرکەوتووەو زۆرجاریش کەوتووە، بەڵام ئەگەر سەنج بدەین کورد لەپاش هەر کەوتنێك بیری لەهەڵسانەوە کردۆتەوەو هەڵساوەتەوەو جارێکی تر تێهەڵچۆتەوەو درێژەی بە بەرخودانی خۆی داوە.

داگیرکەرانی کوردستان بەردەوام هەوڵیانداوە مێژووی کورد بشێوێنن و بیسڕنەوە، ئەو هەوڵانەی داگیرکەرانیش بەدرێژایی مێژوو کاری بۆکراوە (سەرچەمی مێژووی سیاسیو فیکریو ئەدەبی پێش ئیسلام رەشکرایەوە)[٢٣١]. داگیرکەران بۆ گۆڕین و سڕینەوەی مێژووی کورد پەنایان بردۆتە بەر بەکارهێنانی هێزو لەهەر هێرش و پەلامارێکدا بۆ سەر کوردستان ئەوەی دەستیان کەوتووە سووتاندوویانە، لەکاتی هێرشی عەرەب بۆ سەر کوردستان و لەسەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب)دا، عومەر فەرمانی بەلەشکرەکەیدا هەرچی کتێب و نووسراوێکیان کەوتە بەر دەست بیسووتێنن[٢٣٢]. بێگومان کتێب و نووسراوەکانیش زۆربەیان بەرهەمی بیری کوردو تۆماری مێژووی کورد بوون، جگە لەسەرچاوەکانی تری خۆ رۆشنبیرکردن. رەنگە

٢٣١- رەفیق سابیر، بەرەو مێژوو. . . ل٢٧.

٢٣٢- رەفیق سابیر، بەرەو مێژوو. . . ل٢٨.

بپرسین ئەو هێرشانە هێرشی لەشکری ئیسلام بوون و بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام بەناوچەکە هێرش و پەلاماریان دەکرد، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە سوپاکە سوپای عەرەب بوو (ووشەی "عارەب"و "ئیسلام" لەو سەردەمەدا هاو واتای یەك بوون)[٢٣٣] باشە کە مەبەستیان گەیاندنی پەیامی ئیسلام بووە بۆ مێژوو و کلتوری نەتەوەکانی تریان سوتاندووە؟! ئەگەر مەبەست خۆ سەپاندن و سڕینەوەی نەتەوەکانی تر نەبێت! سەرەڕای ئەو هێرش و پەلامارانەش و پاش ئیسلام بوونی کوردیش، کورد بەردەوام هەوڵی داوە پارێزگاری لەبوون و مێژووی خۆی بکات. پاشتریش دەسەڵاتدارانی عەرەب بۆ درێژەدان بەو سیاسەتە کەوتوونەتە پیلان دانان بۆ شێواندن و سڕینەوەی مێژووی کورد، وەك ئەوەی لەعێراقدا بەناوی (سەر لەنوێ نووسینەوەی مێژوو) دەستکرا بەنووسینەوەی مێژووی عێراق و مێژوو و کلتورو شارستانیەتی باشووری کوردستانیش شێوێنران و کران بە بەشێك لەمێژووی عێراق و عەرەب، ڕژێمی فاشی بەعس هەمووکات هەوڵیداوە کورد بەمێژووی خۆی نامۆ بکات و مێژووی خۆی بەمێژووی عێراق و هی عێراقیش بەهی خۆی بزانێت. شایانی باسە هەمان سیاسەتیش لەسوریادا پیادە دەکرێ. ئەوەش بۆ ئەوەیە کە کورد هەستنەکات مێژوویەکی تایبەت بەخۆی هەیەو خۆی وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ نەبینێت. بەعەرەبکردنی کوردستان مەترسییەکی زۆر گەورەی بۆ سەر سڕینەوەی مێژووی کورد هەیەو لەدوارۆژیشدا کاریگەری ئەو سیاسەتە شۆفێنیەی ڕژێمی عێراقمان زیاتر بۆ روون دەبێتەوەو بەدەردەکەوێت.

٤-داب و نەریت: داب و نەریت یەکێکە لەتایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی هەر نەتەوەیەك و، بگرە وەك ناسنامەی نەتەوەش سەیر دەکرێت. کوردیش خودان داب و نەریتی رەسەنی خۆیەتی و ئەو داب و نەریتەی لەنەتەوەکانی تری جیا کردۆتەوەو تایبەتمەندییەکی جیای پێبەخشیوە، ئەو داب و نەریتانەش گوزارشت لەهەڵس و کەوت و واقیعی ژیانی رۆژانەی کۆمەڵی کوردەواری دەکەن. دەسەڵاتی داگیرکەری

---

٢٣٣- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . ل٧٨.

عـەرەبی هـەمووکات هـەوڵی داوە ئـەو داب و نەریتـە رەسـەنانەی کـورد بـشێوێنیو بـسڕێتەوەو لەسـەرەتای هێرشـی لەشـکری عـەرەب بـۆ سـەر کوردسـتان کـار بـۆ ئـەوە کـراوە (گـەلی کـورد بـەزمان و کولتـوورو ژیـانی نەتـەوەیی خـۆی نـامۆ کـرا)[٢٣٤]و، دەیانویست نەتەوەی کورد لەرابردووی خۆی دابڕن و داب و نەریتێکی تری بەسـەردا بسەپێنن. دەسەڵاتدارانی عەرەبی داگیرکەری کوردستان بۆ سڕینەوەی داب و نـەریتی رەسەنی کوردەواری هەموو شێوازێکیان گرتۆتە بەر، وەك قەدەغەکردنی ریزو رەسـم و یادکردنـەوە نەتـەوەییو ئـایینیو نیـشتمانییەکان، قەدەغـەکردنی پۆشـینی جـل و بەرگی کوردی (وەك ئەوەی لەسوریا پیادە دەکرێت)[٢٣٥]، هـەروەها هەوڵیانـداوە نـاوی بۆنـەو جەژنـە نەتەوەییـەکانی کـورد بگـۆڕن و تێکـەڵ بـەیادو بۆنـەکانی خۆیـانی بکـەن وەك ئـەوەی جـەژنی نـەورۆزیان کـردووە بـە (عیـد الربیع وعیـد الـشجرة وعیـد الام). دابەش کردنـی نەتـەوەی کـورد بەسـەر سـێ نەتـەوەی تـری رۆژهـەڵات (عـەرەب، تـورك، فارس) وای کردووە سێ واقیعی کۆمەڵایەتی جیا لای کورد دروستبێت، لەبەر ئـەوەی نەتـەوەی سەردەسـت هـەمووکات هەوڵـدەدات داب و نـەریتی خـۆی بـسەپێنێتە سـەر نەتـەوەی بندەسـت. ئەگـەر بـەوردی سـەرنج بـدەین دەبیـنین لەباشـوور و رۆژئـاوای کوردسـتان کـورد کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەری داب و نـەریت و کلتـوورو پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانی عەرەب و لەباکووری هی تورك و لەرۆژهەڵاتیشدا هی فارس.

یەکێك لەئامانجەکانی بەعەرەبکردنی کوردستانیش تێکشکاندن و سڕینەوەی داب و نەریتە رەسەنەکانی کورد بووە، بەتایبەت کاتێك رژێمی بەعس کەوتە رووخانـدنی گونـدو شارۆچـکەکانی کوردسـتان و راگواسـتن و پـەرتکردنی خـەڵکی کوردسـتان، ویستی داب و نـەریتی کۆمـەڵی کـوردەواری هەڵتـەکێنێو بیـشێوێنێو لـەناوی ببـات، لەبـەر ئـەوەی هـەر یـەك لەناوچـەکانی کوردسـتان خـودان داب و نـەریتی رەسـەنی کوردانـەی خۆیـەتی، رژێمـی عێـراق ویستی بەراگواسـتنی گونـدەکان و تێکـەڵکردنی

---

٢٣٤- رەفیق سابیر، بەرەو مێژوو. . . ل٢٧.

٢٣٥- لەباکووری کوردستانیشدا رژێمی داگیرکەری تورکیا پۆشینی جل و بەرگی کوردی قەدەغە کردووە.

خەڵکی ناوچەکان و نیشتەجێکردنیان لەئۆردوگا زۆرە ملێکاندا زیاتر کۆنترۆڵی خەڵکەکە بکات و، لەرابردووی خۆیان دایانبڕێت.

٥-**هەستی هاوبەش**: هەر نەتەوەیەك خودان هەستێکی هاوبەشە، کە تاکەکانی نەتەوەکە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، هەستێکی هاوبەش بەرامبەر بەخاك و زمان و کلتورو مێژوو داب و نەریت، کە لەنێوان تاکەکانی هەر نەتەوەیەکدا هاویەشن و هی هەموو تاکەکانی نەتەوەکەن هەیەو، خۆشیان دەویۆ بەرەڤانی لێدەکەن و دەیپارێزن. شۆڤێنیەتی عەرەبی هەمووکات هەڵیداوە، لەرێی شێواندن و تێکشکاندنی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی کورد، هەستی نەتەوەیی کورد کز بکات و لەناوی ببات، بۆ ئەمەش کەوتۆتە داگیرکردنی خاك و قەدەغە کردنی زمان و شێواندنی مێژوو و سڕینەوەی داب و نەریتە رەسەنەکانی کورد، بۆ ئەوەی کورد بەرابردووی خۆی نامۆ بکات و هەستی نەتەوەیی لا نەهێڵێت.

هەر بۆیەش رژێمی فاشی عێراق و سوریا کەوتنە راگواستنی گوندە کوردییەکانی سەر سنووریان و تەواوی ئەو گوندانەی کەوتبوونە سەر سنووری دەستکردی (عێراق- سوریا)و (عێراق- ئێران)و (عێراق- تورکیا) هاتنە وێرانکردن و خەڵکەکەشیان راگواست و دەربەدەر کرد. مەبەست لەمەش نەهێشتنی دوورایی مێژوویی و جوگرافی و کۆمەڵایەتی نێوان پارچەکانی کوردستان و کز کردنی هەستی نەتەوەیی کورد بوو، بۆ زیاتر کز کردنی هەستی هاوبەشی نەتەوەیی کورد، چ لەپرۆگرامەکانی خوێندن و چ لەهۆیەکانی راگەیاندندا، بەردەوام باس لەمێژوو و شارستانیەتی عەرەب دەکەن و بەکوردی ئاشنا دەکەن و هەوڵدەدەن لەم رێگەیەوە هەستی کورد بەرەو بەعەرەب بوون کێش بکەن. هەروەها رژێمی عێراق لەکاتی شالاوەکانی ئەنفالە بەد ناوەکاندا جاشەکانی هەولێرو دەڤەری گەرمیان و سلێمانی دەبرد بۆ دەڤەری بادینان و هی دەڤەری بادینان و هەولێریشی دەبرد بۆ دەڤەری گەرمیان و سلێمانی و ئازادیشی دەکردن لەتالان و کوشتن و سوتاندندا. ئەوەشی بۆ ئەوە بوو تا دژایەتی لەنێوان دەڤەرەکانی کوردستاندا دروست بکات و خەڵکی دەڤەرەکانی کوردستان بەچاوی نامۆ و دوژمن سەیری یەکتر بکەن. جگە لە

لەدروستکردنی جۆرەها نوکتەو قسەی هیچ و پووچ لەسەر شارەکانی کوردستان و بەکارهێنانی شەڕی دەروونیو پەنابردنە بەر شوشتنەوەی مێشك (غسل الدماغ)و.تد.

پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان کاریگەرییەکی زۆر نێگەتیڤانەی کردۆتە سەر کزبوونی هەستی نەتەوەیی کوردو، تائێستاش ئەو کاریگەرییە بوونی ماوەو هەستی پێدەکرێت. ئەمەش هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ تێکشکاندنی هەستی نەتەوەیی کوردو سڕینەوەی یەکێك لەتایبەتمەندییە نەتەوەییەکانمان کە ئەویش (هەستی هاوبەش)ە.

بەم شێوەیە شۆڤێنیەتی عەرەب هەوڵدەدات بۆ تێکشکاندن و سڕینەوەی تەواوی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی کورد (خاك، زمان، مێژوو، داب و نەریت و هەستی هاوبەش)، بێگومان ئەو مەترسیانەش گەورەترین هەڕەشەن لەسەر ئێستاو دوا ڕۆژی ئاسایشی نەتەوەیی کورد، بۆیە دەبێ هەموو لایەکمان بیر لەوە بکەینەوە چۆن بەرەنگاری پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان ببینەوەو پارێزگاری لەبوون و مانەوەی نەتەوەییمان بکەین.

# بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان

کورد بەدرێژایی مێژوو ئامادەبووە بەرگری لەخاك و بوونی خۆی بکات و دلێرانە بەرگری کردووەو، ئامادەبووە لەپێناو پاراستنی خاك و بوونی نەتەوەیی بەلافاو خوێن برێژێت و نەیەڵێت لەشکری عەرەب بێتە کوردستان، نموونەی ئەو شەڕو بەرەنگاربوونەوانە لەمێژووی کورددا زۆرن و زۆربەی سەرچاوە مێژوویەکان باسیان کردووە (لەشکری ئیسلام سێ شەوو سێ رۆژ خەڵکیان کوشت! لەئەنجامدا لافاوی خوێن لەقەد پاڵی کێو وەك چەم هەستا.. هەموو کوردەکان کوژران.. ژن و منداڵیان بەنسیب لەشکری عەرەب بوو.. ژنەکانیان داگیرکران)[٢٣٦]. ئەو داستان و بەرەنگارییانەی کورد بەرامبەر لەشکری داگیرکەری عەرەب لەناو دەقە ئەدەبییەکانی ئەدەبی کوردیدا زر بەزەقی رەنگی داوەتەوە (ئەدەبی کوردی پڕە لەچیرۆکی نەتەوایەتی. ئێستا دەتوانین زۆر شیعری ئەوتۆ پەیدا بکەین کە بۆ چەرخی حەڤدە دەگەڕێتەوەو باسی بەر بەرەکانی پەلاماری عەرەب دەکا)[٢٣٧]. جگە لەدەقە ئەدەبییەکاندا، ئەو بەرەنگارییانەی کورد بەرامبەر لەشکری داگیرکەران لەگۆرانی کوردیشدا رەنگی داوەتەوە (دەتوانین لەهەر ناوچەیەکی کوردستان گۆرانی ئەوتۆمان گوێ لێ بێ کەزیاتر لەسەعاتێك وەخت دەگرێ و باسی قارەمانەتی گەلی کورد لەخەبات دژی داگیرکەرانی بێگانە دەگێڕێتەوە)[٢٣٨]. کورد بۆ پاراستنی بوونی خۆی بەرگری لەخۆی کردووەو هێرشی نەکردۆتە سەر کەس و چاوی لەداگیرکردنی خاکی کەس نەبووە، بەڵکو داگیرکەران هێرشیان کردۆتە سەروچاویان لەداگیرکردنی خاکەکەی بووە، ئەویش بەرەنگاری ئەو هێرش و پەلامارانە بۆتەوە، ئەوەش مافێکی رەوای خۆیەتی لەماڵی خۆیدا بەرگری لەخۆی بکات. ئەوە لەسەدەکانی رابردوودا، لەمێژووی هاوچەرخیشدا، کورد بەرەنگاری هێرشی داگیرکەران بۆتەوەو شێوازی جیا جیاشی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێناوە، جگە لەرووبەڕوو بوونەوەی چەکداری نامەو یاداشت بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان نێردراوەو مانگرتنی سەرتاسەریش لەکوردستان راگەیەنراوە. لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، کە رژێمی داگیرکەری عێراق کەوتبووە

---

٢٣٦- رەفیق سابیر، بەرەو مێژوو. . . ل٥٧.

٢٣٧- درکتۆر عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد. . . ل٣٣.

٢٣٨- هەمان سەرچاوە. . .

گوند رووخاندن و سووتاندن و راگواستنی کورد لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیدا، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێرشەی عێراق (بارزانی نەمر) ڕێبەری شۆڕشی کورد لە ١/١/١٩٦٦دا بیر خەرەوەیەکی‌دا نەتەوە یەکگرتووەکان و، لەو بیر خەرەوەیەدا سیاسەتی خاك سووتاندنی ئیدانە کردو، داواشی لە UN کرد لیژنەیەك بنێریتە ناوچەکانی شەڕ تا بەچاوی خۆیان ئەو ڕەفتارە نامرۆڤانەی ڕژێمی عێراق ببینن[٢٣٩].

هەر بۆ رووبەڕوو بوونەوەی پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان و بەتایبەت دژی ئەو هێرشەی کە کرایە سەر گوندە کوردییەکانی دەڤەری شنگاڵ بۆ بەعەرەبکردنیان، بە فەرمانی (بارزانی نەمر) لە ٢٥/٨/١٩٧٣دا مانگرتنێکی گشتی لەلایەن گەلی کوردستان لەباشووری کوردستاندا ئەنجامدراو لەو ڕۆژەدا تەواوی ناوچەکانی کوردستان بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان مانیان گرت[٢٤٠]. هەروەها بۆ بەگژداچوونەوەی سیاسەتی راگواستن و بەعەرەبکردن ڕۆژی ١٣/٥/١٩٨٧ مانگرتنێك لەهەڵەبجە ئەنجامدرا. دواتر لەگفتوگۆکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا بەردەوام ڕەخنە لەسیاسەتی بەعەرەبکردن گیراوەو جەخت کراوەتەوە سەر کوردێتی شارە کوردستانیە بەعەرەبکراوەکان و، هۆکاری سەرەکی دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ١٩٧٤دا دەگەڕێتەوە بۆ سوور بوونی کورد لەسەر دیاریکردنی سنووری جوگرافی باشووری کوردستان و دەستهەڵنەگرتن لەشاری کەرکوکی کوردان. هەڵوێستە نەتەوەییەکانی بارزانی نەمر لەم بارەیەوە لای هەموو لایەك روون و ئاشکران کەچۆن بەرگری لەکەرکوك و خانەقین و شێخان و شنگاڵ و ناوچەکانی تر کردووەو دەستبەرداریان نەبووە. هەروەها لەکاتی گفتوگۆی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا لەساڵی ١٩٩١دا، دیسان جەخت کراوەتەوە سەر ئەو پرسەو داوا لەرژێمی عێراق کراوە کە تەواوی ئەو عەرەبانەی هێنراونەتە ناوچەکانی کوردستان بگێڕدرێنەوە شوێنی پێشووی خۆیان بۆ ئەوەی جوتیارانی کوردیش بگەڕێنەوە سەر شوێنی پێشووی خۆیان، ئەمەش دەبێ هەموو ئەو کەسانە بگرێتەوە کە لەساڵی (١٩٦٣)ەوە هێنراونەتە ناوچەکانی کوردستان[٢٤١]. ئەمەش لای ڕژێمی عێراق پرسێکی گەورەیەو نایەتە قبوڵکردن، هەر

---

٢٣٩- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی. . . ل٢٥٤.

٢٤٠- جريدة خەبات، العدد ١٠٩٦ الجمعة ٢٠/٩/٢٠٠٢.

٢٤١- الشيخ عطا الطالباني، عندما تتكلم الارقام. . . ص٦.

لەسەر پرسی کوردستانی بوونی کەرکوك سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی پێیداگرتووەو جەختی کردۆتەوە سەر کوردستانی بوونی ئەو شارە. ئەم هەڵوێستەی کوردیش وای لەکەسێکی وەك (تاریق عەزیز) کردووە کە شەکر بشکێنێ‌و بڵێ: (چۆن ئێمە بۆ ئەندەلوس گریاین، دەبێ ئێوەش ئاوا بۆ کەرکوك بگرین)[٢٤٢]. بەڵام تاریق عەزیز و تەواوی سەرانی رژێمی داگیرکەری عێراق با باش بزانن کە کورد نەك فرمێسك بەڵکو بۆ رزگارکردنی کەرکوك خوێن دەرێژێت و راپەرینی بەهاری ١٩٩١ی گەلی کوردستانیش گەواهیدەری ئەو راستییەیە.

بێگومان بەعەرەبکردنی کوردستان لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە پیلانرێژی بۆ کراوەو پرۆگرامی تایبەتی بۆ دانراوەو لەسەر هەموو ئاستێکدا کاری بۆ دەکرێت تا بەمرۆ گەیشتووە، لەفەسڵی دووەمی ئەم کتێبەدا مەترسییەکانی تاوانی بەعەرەبکردنی کوردستانمان خستۆتە روو کە بەعەرەبکردن پیلانێکە بۆ سرینەوەو نەهێشتنی نەتەوەی کورد بەخاك و خەڵکەوە. کەواتە بەعەرەبکردن هەرەشەیەکی گەورەیە لەسەر هەموولایەکمان و بەرەنگاربوونەوەشی ئەرکی نیشتمانی‌و نەتەوەیی هەموو لایەکمانە. وەك چۆن داگیرکەران پرۆگرامی تایبەتیان بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان هەیە، دەبێ ئێمەش هەوڵبدەین پلان و پرۆگرامی تایبەتمان بۆ بەرەنگاربوونەوەی پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان و سرینەوەو نەهێشتنی شوێنەوارەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان هەبێت.

لێرەدا هەوڵ دەدەم زۆر بەکورتی باس لەچەند شێوازێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان بکەم:

١-**دیاریکردنی سنووری جوگرافی کوردستان:** بەر لەهەر شتێك دەبێ مرۆڤ بزانێت سنووری نیشتمانەکەی لەکوێوە بۆ کوێیەو، بەباشی وڵاتی خۆی بناسێت. سنووری جوگرافی هەر وڵاتێك بریتییە لەو هێڵەی کە بەچوار دەوری رووبەری وڵاتەکەدا دیاری کراوەو، ئەو دەوڵەتەش لەچوارچێوەی ئەو سنوورەدا دەسەڵاتی یاسایی خۆی بەکار دەهێنێت. کوردستانی گەورە وەك نیشتمان خودان ئەو سنوورە جوگرافییەیەو (دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای کیشوەری ئاسیاوە. سنوورەکەی لەباکوورەوە، لەگەڵ ئازەربایجان و ئەرمینیاو تورکیادایە. لەباشوورەوە، ئێران و کەنداوی (فارسی-عەرەبی). لەرۆژهەڵاتەوە، ئێرانە. لەرۆژئاواشەوە، عێراق و سوریایە)[٢٤٣]. سنووری

---

٢٤٢- نفس المصدر . . .

٢٤٣- د.عەبدوڵلا غەفوور، جوگرافیای کوردستان. . ل١٥.

کوردستانی مەزن لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست تاسەر کەنداوی فارس درێژ دەبێتەوە. سەیری نەخشەی ژمارە (٢) بکە. بەڵام لەگەڵ دابەشکردنی کوردستان بەسەر هەریەك لە (عێراق، ئێران، تورکیا، سوریا)دا، چوار سنووری جوگرافی جیا بۆ هەر یەك لەپارچەکان دروستکراون. بۆ دیاریکردنی سنووری هەر یەك لەپارچەکانیش دەتوانین بگەڕێینەوە سەر نەخشەی کوردستانی گەورەو پشتی پێببەستین. ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە باسکردنە لەسنووری جوگرافی باشوور و رۆژئاوای کوردستان کە کەوتونەتە بەر پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان. بەنسبەت سنووری باشووری کوردستان لەشنگاڵەوە دەستپێدەکات و تا شارۆچکەی بەدرە لەپارێزگای (کوت) درێژ دەبێتەوە[٢٤٤]. (لەناوقەدی عێراقەوە لەباشووری رۆژهەڵاتی شارۆچکەی بەدرە لەپارێزگای واست دەست پێدەکا، بەرەو باکوور تاپردی نەوت لەرۆژئاوای شارۆچکەی مەندەلی هەڵدەکشێ، بە تەنیشت بەرزاییەکانی حەمرینەوە تا فەتحە دەڕواو شان بەشانی رووباری دیجلە سەر دەکەوێ و لەباکووری شاری موسڵ بەرەو باشووری رۆژئاوا بادەداتەوە بەئاراستەی شارۆچکەی حەزەر پاشان بەرەو رۆژئاوا بەئاراستەی سنووری عێراق– سوریا لەباکووری شارۆچکەی بەعاج)[٢٤٥]. سەیری نەخشەی ژمارە (٣) بکە. هەر لەم رووەوە پرۆژەی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ کۆماری عێراقی فیدراڵ زۆربەی هەر زۆری ناوچە کوردییەکانی باشووری کوردستانی دیاریکردووە. بەڵام بەڕای من پارێزگای موسڵ بەشێکە لەسنووری جوگرافی باشووری کوردستان و ئەوەشم لەفەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەدا روون کردۆتەوە. هەروەها هەردوو شارۆچکەی (شارەبان و بەلەدرۆز) لەپارێزگای بەعقوبە بەشێکن لەخاکی کوردستان و بەعەرەبکراون و، شارۆچکەی (جەسان)ی خوار بەدرەش بەشێکە لەکوردستان و تکریت و دیالا (بەعقوبە)و کوت و عیمارەش بەشێکن لە کوردستان و بەعەرەبکراون سەیری نەخشەی ژمارە (٤) بکە. لەزۆر سەرچاوەدا باشووری وڵات رووبەرەکەی بە ٨٦٠٠٠کم٢ دیاری کراوە، بەڵام بەڕای شارەزای تر زیاترەو بە ٨٧١١٧کم٢ دیاری کراوە کە رەنگە ئەمەیان تارادەیەك دروستتر بێت. سنووری جوگرافی رۆژئاوای کوردستانیش کەوتۆتە سەر سنووری باشوور و باکووری کوردستان و شارە سەرەکییەکانی بریتین لە (حەسەکە، قامشلۆ، کۆبانێ، عفرین) سەیری نەخشەی ژمارە (٥) بکە. لەسەر هەموو لایەکمان پێویستە کە زۆر

---

٢٤٤- جريدة خبات، العدد ١٠٩٢، الجمعة ٢٣/٨/٢٠٠٢.

٢٤٥- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، جیوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق. . . ل١٩.

بـــەوردی لەســـنووری جـــوگرافی کوردســـتان بکۆڵینـــەوەو راســـتییە میـــژوویی‌و جوگرافییـــەکان بـــۆ کەســـانی تـــر بخەینـــە روو، ئەمـــەش دەبێتـــە شـــێوازێك بـــۆ بەرەنگاربوونـــەوەی بەعـــەرەبکردنی کوردســـتان و ســـڕینەوەی شـــوێنەواری بەعـــەرەبکردنی کوردســـتان، مـــرۆڤ کـــە ســـنووری وڵاتـــی خـــۆی زانـــی هـــەموو کاتێـــك دەتوانێت داوای خاکی زەوتکراوو داگیرکراوی بکاتەوە.

**٢-نووسینەوەی مێژووی کوردستان:** کورد زۆر بەکەمی مێژووی خۆی نووسیوەتەوە، زۆربەی مێژووی کورد بەشێوێنراوی لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان نووسراونەتەوە، لەبەر ئەوەی هێز مێژوو دەنووسێتەوە چۆنی بوێت ئاوای دەنووسێتەوەو چۆنی بوێت ئاوای دەشێوێنێت. مێژووی کورد کە لەلایەن نەتەوەی سەر دەستەوە نووسرابێتەوە بەشێواوی‌و دوور لەراستی نووسراوەتەوە، شۆڤێنیەتی عەرەب مێژووی کورد و شارستانیەتی کورد بەمێژوو شارستانیەتی عەرەب دەزانێت، ئەوەتە لەئەدەبیاتی حزبی بەعسی فاشیدا بەم شێوەیە باس لەکوردو مێژووەکەی دەکرێت (بەدرێژایی چەندین سەدەیە کورد و عەرەب بەیەکەوە وەکو یەك گەل لەناویەك مێژوودا دەژین، هیچ جیاوازییەکیش لەنێوان ئەوان و عەرەبدا نییەو، لەوڵاتانی عەرەبیشدا وەکو عەرەبێك مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکرێت)[٢٤٦] ئەوە بۆچوونی شۆڤێنیەتی عەرەبە بەرامبەر بەکوردو مێژووەکەی، کە بۆچوونێکی فاشییانەو دوور لەڕاستییەو دەبێ بەنووسینەوەی مێژووی کورد بەر پەرچی تەواوی ئەو بۆچوونە نادروستانە بدرێتەوە، بۆیە دەبێت بەزووترین کات کار بکەین بۆ نووسینەوەی مێژووی خۆمان بەدەستی خۆمان، ئەم ئەرکەش بەپلەی یەکەم دەکەوێتە سەرشانی حکومەتی کوردستان و دەبێ بۆ ئەم مەبەستە مێژوونووسانی کوردستان رابسپێرێت و هاوکارییان بکات، بۆ ئەوەی مێژووی شێوێنراوی کورد سەر راست بکرێتەوە.

**٣-بەرپەچدانەوەو بەرەنگاربوونەوەی هـزری شـۆڤێنیەتی عـەرەبی:** وەك لەپێشووتردا روونمـانکردەوە، بەعـەرەبکردنی کوردسـتان لـەهزرێکی شـۆڤێنی عەرەبییـەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە دەبێت ئێمەش وەك کورد هەوڵبدەین بەگژ ئەو بۆچوونە شۆڤێنییە داگیرکارانەیەدا بچینەوە، کە هزرێکی بۆگەنەو خزمەت بەپەیوەندی نێوان کورد و عەرەب ناکات و دەبێتە هۆی دروستکردنی دژایەتی لەنێوان هەردوو نەتەوەدا. ئەم ئەرکەش دەکەوێتە سەرشانی هەموو لایەکمان و بەتایبەت چینی رۆشنبیران و بیرمەندان و، هەروەها ئەو عەرەبانەی کە باس لەپەیوەندی کورد و

---

٢٤٦- منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق. . . ص٣٧٤.

عەرەب دەكەن دەبێ بەگژ ئەو بۆچوونە فاشییانەی دەسەڵاتی عەرەبیدا بچنەوە.
زۆرجار لێرەو لەوێ باس لەبرایەتی كورد و عەرەب دەكرێت، بەڵام ئەو باسە تەنها لای كوردەو كورد جەخت دەكاتەوە سەری و عەرەبیش زۆر بەكەمی بۆ ئەم مەبەستە كار دەكات (برایەتی كورد و عەرەب جارێ نێوێكی بێ نێوەرۆكە، چونكە ئەو عارەبانەی باوەڕیان بەو برایەتییە هەیەو ئارەزووی دەكەن، هیچ دەسەڵاتێكیان بەدەستەوە نییە)[247] زۆرجاریش داواكردن و باس كردنی برایەتی نێوان كورد و عەرەب لەلایەن شۆڤێنیەتی عەرەبەوە هەر بەمەبەستی زیاتر بەعەرەبكردنی كورد بووە، شۆڤێنیەكی عەرەب ئاوا باس لەبرایەتی كورد و عەرەب دەكات: (ئێمە برایانی كورد بە بەشێك لەخۆمان دەزانین و، خۆشمان بە بەشێك لەوان دەزانین)[248]. جگە لەمە شۆڤێنیەتی عەرەبی هەوڵدەدات بزاڤی نیشتمانی كوردیش بكاتە بەشێك لەمێژووی عەرەب و بە بەشێك لەشۆڕشی عەرەبی دەزانێت (بزاڤی نیشتمانی كورد بەشێكی رەواو رەسەنی شۆڕشی عەرەبییە)[249]. ئەوەش وەك بڕگەیەك لەئەدەبیاتی حزبی بەعسدا تۆمار كراوەو كاری لەسەر دەكرێت. عەرەب تائێستاش وەك كێشەیەكی سیاسی سەیری پرسی كورد ناكات و بەپرسێكی لاوەكی دەبینێ. لەبڕیارو راسپاردەكانی كۆنگرەی حەوتەمی هەرێمی عێراقی حزبی بەعسدا هاتووە (مافە نەتەوەییەكانی كورد لەبنەڕەتدا مافی دیموكراتین. .)[250]. ئەمەش لەراستیدا وانییەو پرسی كورد پرسێكی سیاسییەو بریتییە لەپرسی دابەشكردن و داگیركردنی خاكی كوردستان و چەو ساندنەوەی نەتەوەی كوردو، خەباتی كوردیش بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی كوردستان و مافە نەتەوەییە سیاسییەكانە نەك شتی تر. بەم شێوەیە شۆڤێنیەتی عەرەبی لەرووی هزرییەوە كار بۆ بەعەرەبكردنی كورد و كوردستان دەكات و هەوڵدەدات كورد بكات بە بەشێك لەعەرەب. بۆیە دەبێ كورد بەهەموو شێوەیەك بەرپەرچی ئەو بۆچوونە بۆگەنە عەرەبییانە بداتەوەو پرۆگرامی تایبەتی خۆی بۆ ئەم مەبەستە هەبێت.

٤-**وشیار كردنەوەی جەماوەر:** تاوانی بەعەرەبكردنی كوردستان، تاوانێكی گەورەیەو دژ بەتەواوی جەماوەری كوردستان ئەنجامدەدرێت، بۆیە دەبێ لەم بارەیەوە كار

---

٢٤٧- جەمال نەبەز، كوردستان و شۆڕشەكەی. . . ل١٧٩.

٢٤٨- منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق. . . ص١٣.

٢٤٩- منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق. . . ص٣٧٣.

٢٥٠- هەمان سەرچاوە. . . ص٣٧٢.

بکریَو جەماوەر لەمەترسیەکانی بەعەرەبکردن ئاگادار بکرێتەوەو، ئەم پرسە بۆ ناو جەماوەر شۆڕبکرێتەوەو هانی جەماوەر بدرێت لەدژی بەعەرەبکردنی کوردستان بوەستنەوە، بۆ ئەمەش پێویستە هۆیەکانی راگەیاندن رۆڵی خۆیان ببینن و بەردەوام پرۆگرامی تایبەت و راپۆرتی تایبەت پێشکەش بەجەماوەر بکەن، هەروەها گرتنی کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ ئەم مەبەستە زۆر پێویستە، بەتایبەت بۆ ئاوارەو دەرکراوەکانی ناوچە بەعەرەبکراوەکانی کوردستان و بەردەوام دڵنیا بکرێنەوە کە رۆژێك لەرۆژان دەگەرێنەوە سەر زەوی‌و ماڵ و حاڵی خۆیان و ئەو عەرەبانەی کە هێنراونەتە سەر خاکی کوردستانیش دەبێ ئەوە باش بزانن کە هاتنەکەیان کاتییەو ئەو خاك و شوێنە هی ئەوان نییە، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٧١، ٧٢)، عەرەبەکان ئەوەش باش دەزانن (ئەو عەشایرە عەرەبانەی کە دێنە سەر خاکی باشووری کوردستان، هەمیشە لەدڵەڕاوکێ دان و هەست بەئاسایش و ئاسوودەیی ناکەن و هەمیشە وەك داگیرکارو میوانی سەر خاکی کوردستان تەماشا دەکرێن، دەرکەوت کردەوە نارەواکانی رژێمی عێراق لەرابردوودا نەیانتوانیووە بوونی نەتەوەییمان بسڕنەوەو بێگومان لەئاییندەشدا ئەم کارەی بۆ ناچێتە سەر)[٢٥١]. هەروەها دەبێت جەماوەر هانبدرێتٛ کە خۆی ئامادە بکات بۆ رزگارکردنی ناوچە داگیرکراوەکان، ئەوەش مافێکی رەوای خۆیەتی‌و هەموو ئایین و یاسایەکیش ئەم رێگەیەی پێدەدات، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت: ﴿وَأَخْرِجُوهُمْ مِنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ (سورة البقرة/ ١٩١)و، هەروەها دەفەرموویێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ (سورة البقرة/ ١٩٤) کەواتە بەپێی دەقی ئایەت بۆت هەیە ئەو خەڵکەی هاتۆتە سەر خاکی تۆ دەری بکەیت و ئەو کەسەی کە زوڵمی لێکردوویت تۆش بەهەمان شێوە لەگەڵیدا بجولێیتەوە. کورد بەدرێژایی مێژوو زوڵمی نەکردووە بەڵکو بەردەوام زوڵمی لێکراوەو لەبەرگریدا بووە، بۆیە هەر کاتێ مافی خۆی وەربگرێتەوە چاوی لەماڵی کەسی تر نییەو دەستدرێژی ناکاتە سەر کەس. کلتوری کورد، کلتوری بەرخودان و بەرگری‌و لێبوردەییە، کلتوری عەرەبیش کلتوری هێرش و تاڵان و قڕکردنە، ئەو دوو کلتوورەش زۆر لەیەکتر جیان. جەماوەری کوردیش پەروەردەی کلتوری خۆیەتی‌و لەکەداری ناکات.

جەماوەر رۆڵێکی سەرەکی دەبینی بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی

٢٥١- شەهید سەربەست مەحموود، سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە.. . ل٤٥.

کوردستان، ئەگەر بێت و ڕێکبخرێت و ئاراستە بکرێت. هەموومان باشمان لەبیرە کە جەماوەر چ ڕۆڵێکی لەراپەڕینی گەلی کوردستان لەبەهاری ١٩٩١دا بینی. لەهەمان کاتدا ئەوەشمان لەبیرە ئەو عەرەبانەی هێنرابوونە کەرکوك و مەخموور و شوێنەکانی تر چۆن قوچاندیان و کوردستانیان بەجێهێشت، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە عەرەبی هێنراو داگیرکەرن و خاوەنی ئەو شوێنە نین کە لەسەری نیشتەجێکراون. چارەنووسیشیان لەگەڵ چارەنووسی ڕژێمەکەیاندایە.

**٥-رەقەندی کورد لەدەرەوەی ولات:** رەقەندی کورد لەدەرەوەی ولاتدا، دەتوانن ڕۆڵێکی کاریگەرانە بگێڕن بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان، ئەویش بەخۆپیشاندان و نارەزایی دەربڕین و مانگرتن لەبەردەم باڵوێزخانەکانی عێراق و سوریا لەدەرەوە بۆ راکێشانی سەرنجی جەماوەری ئەو ولاتانەی کە چالاکیەکەی تێدا ئەنجام دەدەن، هەروەها دەتوانن ناوە ناوە یاداشت و بیرخەرەوە بدەنە UN و کەناڵە بڕیار بەدەستەکانی جیهان و تاوانی بەعەرەبکردنی کوردستانیان بۆ روون بکەنەوە، کە تاوانێکە دەچێتە خانەی تاوانەکانی جینۆساید. جگە لەمە دەتوانن بەردەوام وتارو باس بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەزمانی جیا جیا بنووسن بۆ راکێشانی سۆزی جەماوەری ئەو ولاتانەو خستنە رووی ئەو تاوانە بۆیان، بۆ ئەوەی ئەوانیش ئاگاداری ئێش و ئازاری کورد و ئەو تاوانانە بن کە دەرهەقی کورد دەکرێن، تازیاتر لەگەڵماندا هاو سۆز بن. گرتنی کۆڕو کۆبوونەوەو سمینار لەسەر بەعەرەبکردنی کوردستان هەم بۆ رەقەندی کورد و هەم بۆ خەڵکانی بیانی کارێکی پێویستەو شێوازێکی گونجاویشە بۆ بەرەنگار بوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان. رەقەندی کورد لەدەرەوەی ولات بۆ ئەم مەبەستە دەبێ وەکو کورد کار بکات نەك وەکو حزبییەك و، دەبێ جلی حزبایەتی لەبەر خۆی دابکەنێ و جلی کوردایەتی بپۆشێت. بەمەش لەکارەکەیدا زیاتر سەرکەوتوو دەبێت.

**٦-پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخراوە (NGO)کاندا:** پەیوەندی گرتن لەگەڵ ڕێکخراوە ناحکومییەکان (NGO) کارێکی پێویستەو دەبێ هەوڵبدەین پەیوەندی بەهەموو ئەو ڕێکخراوە ناحکومییانە بکەین کە دژی پاکتاوکردنی نەژادی لەسەرتاسەری جیهاندا کار دەکەن و لەکۆنفرانس و چالاکییەکانیاندا بەشدار بین، بۆ ئەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەو تاوانە گەورەیە (بەعەرەبکردنی کوردستان) ئاگادار بکەینەوە. تا ئەوانیش لای خۆیان پاڵەپەستۆ بخەنە سەر ڕژێمی عێراق بۆ دەستهەڵگرتن لەو تاوانەو قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتووان.

**٧-کۆکردنـــەوەی دیکۆمێنـــت:** کۆکردنـەوەو پاراسـتنی ئـەو دیکۆمێنـت و تاپۆیانـەی تایبەتن بە تۆمارکردنی زەوی‌و زاری کوردان بەناوی خۆیان، بۆ ئەوەی لـە لەناوچوون بپـارێزرێن و، وێنەشـیان لێ فۆتۆکـۆپی بکرێـت و بدرێتـە کەناڵـە نێودەوڵەتییـەکان و رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ تا بۆ هەموو لایەك روونبێتەوە ئەو شوێنانە هـی کـوردن و داراونەتە عەرەب. هـەروەها دەبێ کاربکرێت بۆ کۆکردنـەوەی هـەموو ئـەو بەڵگەنامـەو بڕیارانەی عێراق کە تایبـەتن بـە بەعـەرەبکردنی کوردسـتان و هێنـانی عـەرەب بـۆ سـەر خاکی کوردستان و (استیطان) کردنیان و.. ئەو بەڵگەنامانەش بدرێنە رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و کەناڵە بڕیار بەدەستەکانی جیهان بۆ ئەوەی رژێمـی عێـراق زیـاتر ریـسوا بکرێت و بەتاوانبارو پێشێلکاری مافی مرۆڤ بناسرێت.

**٨-نووسەران و رۆشنبیران:** دەبێ نووسـەران و رۆشـنبیران هانبـدرێن بـۆ ئـەوەی تـاوانی بەعەرەبکردنی کوردستان لەبەرهەمەکانیانـدا رەنگبداتـەوە، هـەروەها نووسـینی وتـارو لێکۆڵینەوە لەسەر بەعەرەبکردنی کوردستان بـۆ هۆیـەکانی راگەیانـدن و ریـسواکردنی زیاتری ئەو سیاسەتەی رژێمی عێراق بۆ جەماوەر، ئەرکێکی وڵاتپارێزانـەی نووسـەرو رۆشـنبیرو هونەرمەندانـــە. دەبـــێ لەناوەنـــدی زانکۆکـــانی کوردستانیـــشدا هـــانی لێکۆڵەرەوان بدرێت بۆ ئـەوەی لـەتاوانی بەعـەرەبکردنی کوردسـتان بکۆڵنـەوەو نامـەی ماجـستێرو دکتـۆرا لەسـەر ئـەم تاوانـە بنووسـرێن. رۆشـنبیران لەبەرەنگاربوونـەوەی بەعـەرەبکردنی کوردسـتان دەتـوانن رۆڵێکـی کاریگـەر بگێـڕن و خـودان رای تایبـەت بەخۆیان بن بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی بەعـەرەبکردن و لەگـەڵ کەناڵـەکانی راگەیاندنیـشدا هاوکاری یەکتر بکەن.

**٩-ئۆپۆزسیۆنی عێراق و سـوریا:** لەبەرامبـەر بەعـەرەبکردنی کوردسـتاندا تائێـستا نـە ئۆپۆزسیۆنی عێراق و نە ئۆپۆزسیۆنی سوریا هەڵوێستێکی فەرمییان نیشان نـەداوەو بێدەنگن، بڕوانە بەڵگەنامـەی ژمـارە (٧٣)، دەبـێ کـار بکرێـت بـۆ ئـەوەی ئۆپۆزسـیۆنی وڵاتانی داگیرکەر هەڵوێستی خۆیان لـەم بارەیـەوە رابگەیـەنن ئایـا دژی بەعـەرەبکردنی کوردستانن یان نا؟ بۆ ئـەوەی کـورد ئـەوانیش بناسـێت و بزانێـت هەڵوێـستیان چییـە. خـــۆ ئەگـــەر توانیمـــان وابکـــەین هەڵوێـــستێکی دژ بـــە دەســـەڵاتی داگیرکـــەرانیان لێ وەربگرین، ئەوا هۆکارێك دەبێت بۆ لەیـەکتر نزیکبوونـەوەی کـوردو ئۆپۆزسـیۆنی ئـەو وڵاتانـــەو، خاڵێـــك دەبێـــت بـــۆ خـــەباتی هاوبـــەش لـــەپێناو نەهێـــشتنی دەســـەڵاتە شۆڤێنییەکانی عەرەب.

١٠-كاراكردنی بڕیاری ٦٨٨: دوای ئەوەی ڕژێمی فاشی عێراق کەوتە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی گەلی کوردستان و گەلی عێراق و خەڵکێکی زۆری کوشت و ئاوارەو دەربەدەر کردو، گەلی کوردستان و گەلی عێراق کەوتنە بەر هەڕەشەی لەناوبردنی بەکۆمەڵ، ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بۆ بەرگرتن لەو شاڵاوەو پاراستنی مافەکانی مرۆڤ ڕۆژی ١٩٩١/٤/٥ بڕیاری ژمارە ٦٨٨ی لەدژی عێراق دەرکرد. ئەو بڕیارە ڕێ بەعێراق نادات وەك جاران پێشێلی مافەکانی مرۆڤ بکات[٢٥٢] هەر لەسەر بنچینەی ئەم بڕیارەش ئێستا پارێزگاری نێودەوڵەتی لەناوچە ئازاد کراوەکانی باشووری کوردستان دەکرێت. کورد دەبێت هەوڵبدات لیژنەیەکی تایبەت پێکبهێنێت بۆ کاراکردنی ئەو بڕیارەو پاڵەپەستۆ بخرێتە سەر ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بۆ فراوانکردنی هێڵی پاراستنی کوردستان، کە بەشێوەیەك بێت تەواوی ناوچە بەعەرەبکراوەکانی کوردستان بگرێتەوەو بخرێتە ژێر دەسەلاتی کورد.

١١-دامەزراندنی کۆمسیۆنێك: بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان، پێویستە کۆمسیۆنێك دابمەزرێت و ڕاستەوخۆ سەر بە حکومەتی کوردستان بێت و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و لەسەر ئاستی وڵاتانی عەرەبی نوێنەرایەتی هەبێت و کار بۆ ڕیسواکردنی بەعەرەبکردنی کوردستان بکات.

١٢-هاوکاریکردنی لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان: لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان، لیژنەیەکی تایبەتمەندە بە بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان لە ٢٠٠٢/١/١٣ لەشاری هەولێر لەلایەن کۆمەڵێ کەسایەتی وڵاتپارێز دامەزراوەو، بەرنامەی تایبەتیشی بۆ بەگژداچوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان دارشتووەو، بەردەوامە لەکارو چالاکیداو، دەتوانین بڵێین چالاکترین ئۆرگانە بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٧١، ٧٢). لەسەر هەموو لایەك پێویستە هاوکاری ئەو لیژنەیە بکات و بەپیز بانگەوازەکانیەوە بچێت و لەچالاکییەکانیدا بەشدار بێت. شایانی باسە پێشووتریش لەساڵی ٢٠٠٠دا کۆمیتەی سەکردایەتی یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان YNDK داوای دامەزراندنی مەڵبەندی ڕاگرتنی بەعەرەبکردنی کوردستانی کردووەو کاریشی بۆ کردووە. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٧٦).

---

٢٥٢- د.حکمت حکیم، الدساتیر العراقیة المؤقتة وحقوق المواطن العراقي. . . ص٨.

۱۳-گۆڕینی پرۆگرامی خوێندن: پرۆگرامی خوێندنی قوتابخانەکانی کوردستان گوزارشت لەواقیعی مێژوویی و جوگرافی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و.. کوردستان ناکەن و بەخوێندەڤانان نامۆن. بۆیە پێویستە پرۆگرامەکانی خوێندن هەر لەقۆناغی سەرەتاییەوە تا زانکۆکان بگۆڕێن و پرۆگرامێکی هاوچەرخ دابنرێت کە گوزارشت لەواقیعی کوردستان بکات و ببێتە بنەمایەك بۆ پەروەردە کردنی نەوەی داهاتووی کوردستان، تاوانێکی گەورەیە منداڵی کورد لەکوردستانی ئازاددا لەکتێبەکانی خوێندنیدا لەجیاتی کەش و هەواو دەوروبەرێکی کوردی ببینێت هەمان پرۆگرامی قوتابخانەکانی وڵاتانی کەنداوی عەرەبی بخوێنێت و لەوێنەکانی نێو کتێبەکانیشدا لەجیاتی جل و بەرگی رەسەنی کوردی (دشداشەو جەفیەو عەگال)ی عەرەبی ببینێت!! لەجیاتی مێژوو و جوگرافیای کوردستان مێژوو و جوگرافیای عەرەب بخوێنێت!

۱٤-دامەزراندنی سەنتەرێکی ئەکادیمی: بۆ لێکۆڵینەوە لەسیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان دامەزراندنی سەنتەرێکی ئەکادیمی زۆر پێویستەو کاتی خۆی شەهیدی سەرکردە شەهید سەربەست مەحموود پێشنیاری دامەزراندنی ئەو سەنتەرەی کردو بەنووسینیش بڵاوی کردەوە (پەرلەمان و حکومەتی کوردستان بەشێکی زۆری باشووری کوردستان بەڕێوە دەبات، پێویستە هەوڵی ئەوە بدات، کە مەڵبەندێکی زانستی و فکری و ئەکادیمیانەی بەرفراوان دابمەزرێنێت بۆ دیراسەکردنی پرۆسەی تەعریب و چۆنیەتی نەخشەدانان و بەرگرتن بەم دیاردە ناشارستانیەو هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ئەو ئاسەوارە خراپانەی کە "تەعریب" لەسەر شعوری کورد دروستی کردووە)[٢٥٣]. پێشووتریش کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان YNDK داوای دامەزراندنی سەنتەرێکی لەو جۆرەی کردووە[٢٥٤]. دامەزراندنی ئەو سەنتەرەش یەکێکە لەشێوازەکانی بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان.

۱٥-بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردن لەناو خۆی کوردستان: لەدوای راپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ی گەلی کوردستاندا هەندێ رەوتی سیاسی لەکوردستاندا دروستبوونەو، کار دەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی رۆشنبیرییەکی عەرەبی و گۆڕینی ناوی کوردی بەناوی عەرەبی و جۆرەها کاری تر، دەبێ سنوورێك بۆ ئەو رەوتە دابنرێت، لەبەر ئەوەی رەوتێکە لەدژی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان کار دەکات و کارەکانیشی دەچنە

---

٢٥٣- شەهید سەربەست مەحموود، سەرخۆبوون تاکە چارەسەر.. ل٤٩.

٢٥٤- رۆژنامەی میدیا، ژمارە ٦١ رۆژی ١٥/٢/٢٠٠٠.

خانەی بەعەرەبکردنی کوردستان.

**١٦-هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایانەی پەیوەستن بە بەعەرەبکردن:** کۆمەڵێ یاساو بڕیاری عێراقی و سوری هەن کە ڕێگە خۆشکەرن بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان، دەبێ یاسا ناسانی کورد کار بۆ لابردن و لەکارخستنی ئەو یاسایانە بکەن و، هەوڵی ئەوەش بدەن گۆڕانکاری لەتەواوی یاساو بڕیارانە بکەن کە کوردستان دەکەنە بەشێك لەوڵاتانی داگیرکەر، بۆ نموونە بەناو (یاسای ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانی عێراق) باشووری کوردستانی بە بەشێك لەخاکی عێراق و گەلی کوردستانیشی بە بەشێك لەگەلی عێراق داناوە. وەك لەبڕگەی (د)ی ماددەی یەکەمی یاساکەدا هاتووە: (ناوچەکە بەشێکی جیانەکراوەی خاکی عێراقەو گەلەکەشی بەشێکی جیانەکراوەی گەلی عێراقە)[٢٥٥]، کە لەراستیدا نەکوردستان بەشێکی خاکی عێراقەو نەگەلی کوردستانیش بەشێکی گەلی عێراقە.

**١٧-بەکارهێنانی هێز:** دوای ئەوەی ئەو ڕێگەو شێوازانەی کە لەپێشەوەدا، باسمان کردن کاری خۆیان نەکرد، دەبێ پەنا ببردرێتە بەر بەکارهێنانی هێز بۆ ڕزگارکردن و وەرگرتنەوەی خاکی داگیرکراوی کوردستان و دەرکردنی ئەو عەرەبانەی هێنراون و هاتوونەتە سەر خاکی کوردستان و داگیریان کردووە. ئەوەش مافێکی ڕەوای کوردەو لەلایەن خوای گەورەشەوە ڕێی پێدراوە وەك لەخاڵی چوارەمی ئەو فەسڵەی ئەو کتێبەدا باسکراوە. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ جەماوەر خۆی ئامادەو چەکدار بکات و بڕیاری شۆڕشگێڕانەی خۆی بدات.

ئەو خاڵانەی خستمانە روو هەندێ شێواز بوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوان و پیلانی بەعەرەبکردنی کوردستان و هیڤیدارین لەلایەن لایەنی پەیوەندیدارەوە کاری لەسەر بکرێت.

لەکۆتاییدا دەمەوێت ئەوە بڵێم: کە چارەسەر کردنی سیاسیانەی کێشەی کورد لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ نەهێشتنی هەموو ئەو تاوان و پیلانانەی لەدژی کورددا ئەنجامدەدرێن. چارەسەری سیاسیانەی کێشەی کوردیش تەنهاو تەنها بەرزگارکردنی خاکی کوردستان و پێکهێنانی کیانی سیاسی کورد دەبێت. ئەو کاتە کورد ئاسوودەو ئازاد دەبێت کە ببێتە خودان دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیی و بەسەربەخۆیی و ئازادی بژیت.

---

٢٥٥- سعد البزاز، الاكراد في المسألة العراقية. . . ص١٥٣.

# ئەنجام

لەكۆتايی لێكۆڵينەوەكەدا؛ دەتوانين ئەنجامەكان لەم چەند خاڵەدا چڕ بكەينەوە:

١-ئامانجی رژێمی عێراق و سوريا لە بەعەرەبكردنی كوردستان سڕينەوەو نەهێشتنی نەتەوەی كوردە بەخاك و خەڵكەوە.

٢-پێش فتوحاتی ئيسلامی عەرەب بەهيچ شێوەيەك لەناوچەكەدا بوونی نەبووەو، لەگەڵ هاتنی ئيسلام بۆ ناوچەكە وردە وردە عەرەب هاتوونەتە كوردستان.

٣-بەعەرەبكردن مەترسييەكی گەورەی بۆ سەر تايبەتمەندييە نەتەوەييەكانی كورد (خاك، زمان، مێژوو، داب و نەريت، هەستی هاوبەش) هەيە.

٤-رژێمی عێراق و رژێمی سوريا سووديان لەشێوازی يەكتر بۆ بەعەرەبكردنی كوردستان وەرگرتووە.

٥-لەگەڵ لكاندنی باشووری كوردستان بەعێراقی عەرەبی و رۆژئاوای كوردستان بەسوريای عەرەبيەوە، بەعەرەبكردنی كوردستان شێوازێكی سياسی وەرگرتووە.

٦-رژێمە يەك لەدوای يەكەكانی عێراق و سوريا هەر يەكەو بەپێی سەردەم و دەسەڵاتی خۆی درێژەيان بە بەعەرەبكردنی كوردستان داوە تا بەمڕۆ دەگات.

٧-نەوت و كشوكاڵ دوو هۆكاری سەرەكی بوون بۆ بەعەرەبكردنی كوردستان.

٨-راگواستنی گوندە سنوورییەكان بەمەبەستی لێكدابڕینی كوردی پارچە داگیركراوەكانی كوردستان و نەهێشتنی دوورایییە مێژوویی و جوگرافی و كۆمەلأیەتییەكانی كورد بووە، لەهەریەك لەپارچەكاندا.

٩-بەعەرەبكردنی كوردستان لەهزرێكی شۆڤێنی عەرەبییەوە سەرچاوەی گرتووە.

١٠-بەعەرەبكردنی كوردستان تاوانێكەو، دەچێتە خانەی جینۆسایدەوە.

١١-بەعەرەبكردنی كوردستان هەڕەشەیەكی گەورەیە لەسەر ئێستاو ئایندەی ئاسایشی نەتەوەیی كوردستان.

١٢-بەعەرەبكردنی كوردستان كاریگەری هەبووە لەسەر كزبوونی هەستی نەتەوەیی كورد.

١٣-بەعەرەبكردنی كوردستان كاریگەرییەكی زۆر نێگەتیفانە دەكاتە سەر پەیوەندی كوردی- عەرەبی.

١٤-بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبكردنی كوردستان ئەركی ولأتپارێزانەی هەر هەموو لایەكمانە.

# پاشکۆکان

١- پاشکۆی بەڵگەنامەکان

٢- پاشکۆی نەخشەکان

٣- پاشکۆی وێنەکان

# ١- پاشكۆی بەڵگەنامەكان

بسم الله الرحمن الرحيم

/ قيـــادة فـــل ١

الى / قـيـــادة فق ٢ / قوات خالد بن الولــــيد

رقم المنشـــــى' : ١٢٧ م

تاريخ الانشـــاء : ١٢ /٤/ ١٩٨٨

( ٠ ) رسالتكم السرية والفورية ١٦٥ في١٢ / ٤ / ١٩٨٨ الخاصة بتمشيط منطقة قرداغ ( ٠ )نطلب تزويدنا باحتياجاتكم لغـــرض السيطرة الكاملة على المنطقة حسب طلب القيادة العامة للقوات المســلحة (٠-١) انبؤنا فورا"

ودمتم للنضـــال

اللواء الركن

ســلطان هاشـم

قائـــد الفيلـــق الاول

١٢ / ٤ / ١٩٨٨

**بەڵگەنامەی ژمارە (١)**

بسم الله الرحمن الرحيم

| وزارة الدفاع<br>رئاسة اركان الجيش<br>قيادة الفيلق الاول | امة عربية واحدة<br>ذات رسالة خالدة |
|---|---|

من / قيادة ق ق ٢ ـ قوات خالد بن الوليد

الى / قيادة ف ل ١

| رقم المنشىء | تاريخ الانشاء |
|---|---|
| ١٦١ | ١٥ /٤ /١٩٨٨ |

( ٠ )يرجى تأمين ( ٨ ) ثمانية طائرات هيليكوبتر مع ٢٠ عشرون سيارة حمل لنقل اللواء ٢٩ من منطقة بيره مكرون الى منطقة قرداغ مع طلب تأمين حماية جوية للعملية التي تم تحديده يوم ٢٠/٤/١٩٨٨ لتنفيذها ( ٠ ) انتهت

العميد الركن

عدنان تا جر

قائد قوات خالد بن الوليد

١٩٨٨/٤/١٥

**بەڵگەنامەی ژمارە (٢)**

بسم الله الرحمن الرحيم

رة الـدفاع

ة اركان الجيش

ة الفيلـق الاول

امـــة عربيـــة واحـــدة

ذات رســالة خالــــــدة

من / فـــل ١

الى / القيادة العامة للقوات المسلحة

رقم المنشىء

١٤٢

تاريخ الانشاء

٢٠/ ٤/ ١٩٨٨

(٠) اثناء تمشيط منطقة قرداغ تم القاء القبض على عـــدد

٢٥٠٠ الفان وخمسمائة مخرب وعميل من الرجال والنساء

مع الاستيلاء على قطع الاسلحة والاعتدة المدرجة ادنـــاه

في منطقة قوبي قرداغ

١ ــ ١٠ عشرة اربي جي ٧

٢ ــ ٢٠٠ مائتان كلاشنكوف

٣ ــ ١٠٠٠ الف رمانة ومفرقعات

(٠) تم الاحتفاظ بالاشخاص والاسلحة في مقر الفيلـــق

ننتظر توجيهاتكم بصـدد ذلك (٠) انبونا

اللواء الركن

قـائد الفيلـــق الاول

٢٠/ ٤/ ١٩٨٨

**بەڵگەنامەی ژمارە (٣)**

بسم الله الرحمن الرحيم

وزارة الدفاع
اركان الجيش

امة عربية واحدة
ذات رسالة خالدة

/ وزارة الدفاع / شعبة الامن

الى / دائرة الامن العسكرى

للمعلومات / قيادة فل / ١

رقم المنشىء
٤٨

تاريخ الانشاء
١٩٨٨/ ٤/ ٢١

(٠) نطلب ارسال لجنة امنية من دائرتكم الى قيادة فل / ١ للقيام بواجبات خاصة تنجز المهمة خلال ٢٠ ساعة (٠) انيسون

ودمتم في خدمة الحزب والثورة

العميد
عبد القادر الدوري
مدير شعبة الامن العسكري
١٩٨٨/ ٤ /٢١

**بەڵگەنامەی ژمارە (٤)**

بسم الله الرحمن الرحيم

من / قيادة فق ٢ / قوات خالد بن الوليد

الى / قيادة فـل ١

الرقم

١٢٥ ق

تاريخ الانشاء

١٩٨٨/٤/٢١

( ٠ ) رسالتكم السرية و الفورية ١٢٥ في ٢١/ ٤ / ١٩٨٨ ( ٠ )

تم تنفيذ مضمونها من قبل اللواء ٣٩ وتم تمشيط منطقة قرداغ

من قبل اللواء نفسها بتاريخ ٢٠/ ٤/ ١٩٨٨ ( ٠ ) انتهت

العميد الركن

عدنان ناجي

قائد قوات خالد بن الوليد

٢١ / ٤ /١٩٨٨

بەڵگەنامەی ژمارە ( ٥ )

/ قيادة فيلق ٢

الى / قيادة فيلق ١

| رقم المنشور | تاريخ الانشاء |
|---|---|
| ١٥٢ | ١٩٨٨/٤/٢٣ |

(٠) بعد انتهاء عمليات منطقة قرداغ وتدمير كافة القرى الموجودة في المنطقة تم الاستيلاء على ٢٥٠٠ الفان وخمسمائة نوع من الماشية يحتفظ بها حالياً في مقر اللواء /٣٩ في بيره مكرون (٠) اعلامنا توجيهاتكم بصددها (٠) انتهى

ودمتم لخدمة الحزب والثورة

العميد الركن
عدنان ناجي
قائد الفيلق الاول
١٩٨٨/٤/٢٣

**بەڵگەنامەی ژمارە (٦)**

بسم الله الرحمن الرحيم

القيادة العامة للقوات المسلحة

الى / قيادة الفيلق الاول

امة عربية واحدة

ذات رسالة خالدة

رقم المنشىء: ٢/م خ

تاريخ الانشاء: ٢٣ / ٤ / ١٩٨٨

(٠) رسالتكم السرية والفورية ١٤٢ في ٢٠/٤/١٩٨٨ يوزع المخربون والعملاء البالغة عددهم / ٢٥٠٠ الفان وخمسمائة على النحو التالي (٠) الرجال يرسلون الى قيادة فل ٤ (٠) النساء يرسلن الى قيادة فـل ٣ (٠) الاطفال يرسلن الى معسكر ندريب الدووع في تكريت (٠) يرسلون بصحبة باء بوزين من قبلنا وبسيارات خاصة (٠) انتهـت

م / خ

القيادة العامة للقوات المسلحة

٢٣ / ٤ / ١٩٨٨

بەڵگەنامەی ژمارە (٧)

حزب البعث العربي الاشتراكي
« المكتب العسكري »
قيادة فرع نينوى العسكري

امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة

سري للغاية

العدد: ٢٧/ ٤٠٨٧٠
التاريخ: ٢٢/ ١٢/ ١٩٨٨

الى / قيادة شعبة اربيل العسكرية
م / السكن في محافظة التاميم

٢٧/ ١٠٧٥٠
١٩٨٨/١٢/٢٤

تحية رفاقية:

كتاب المكتب العسكري ٣١٩٤٩ في ١٩٨٨/١٢/١٧

طيا استمارة الانتقال الى محافظة التاميم العائدة بن عوض حسين فارس هذال المنسوب الى فرع الحماية والحراسة/٢٥

نرجو الاطلاع وتثبيت المعلومات عليها واعادتها الينا ... مع التقدير

ودمتم للنضال

المرفقات

١٠ استمارة
٢- كتاب نقل

الرفيق
محمد سلمان حمدي
امين سر قيادة فرع نينوى العسكري

نسخة الى /

المتابعة / مع الاوليات

سري للغاية

**بەڵگەنامەی ژمارە ( ٨ )**

